پرۆژەی هاوبەش

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

کۆمەڵەی ئینسکلۆپیدیای کوردستان


- **کوردستان لە سەفەرنامەی بیانیدا ـ (٤)**
- **سەفەرنامەی جیمس مۆریە**

- وەرگێڕانی: شەهاب مەحمود
- نەخشەسازی ناوەوە: **ڕێدار جەعفەر**
- بەرگ: هۆگر سدیق
- نرخ: (٢٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (٣٦)
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٨٠٠)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## سەبارەت بە نووسەری کتێبەکە و دەرئەنجامگیرییەکانی

جیمس ژۆستینین مۆریە (james kustinin morier) نووسەری ئەم کتێبە، لەدایکبووی ١٧٨٠ی زاینی لە ئێسمیرنە (smyna) یان ئەزمیر (Izmir)ی نویَ لە تورکیە. لە ١٩ی مارسی ١٨٤٩ لە بریتن ساکس (Brighton sussex) کۆچی دوایی کردووە ئەم سیاسەتمەدار و نووسەرە ئینگلیزییە پتر لە کتێبی حاجی بابای ئەسفەهانییەوە (١٨٢٤) کە ڕاپۆرتێکی زۆر چاکە لە شێوەی چیرۆکدا، سەبارەت بە شێوەی ژیانی ئێرانییەکانی ئەو سەردەمە و ماوەیەکی باش کاری کردووەتە سەر شێوەی تێڕوانینی خەڵکی ئینگلیزی زمان سەبارەت بە ئێران. وەرگێڕدراوە فارسییەکەی لە ١٩٠٥ی زاینیدا بووە ڕچەشکێن و سەربەندی چیرۆکە ڕەخنەییە کۆمەڵایەتییە نوێیەکانی ئێران.

حاجی بابا یەکەمین کتێب لە زنجیرەیەک چیرۆک بوو کە مۆریە پاش خانەنشینی دەستی دایە نووسینیان، زانیارییەکانی سەبارەت بە ئێران و دانیشتوانی لە ساڵانی ١٨٠٩ تا ١٨١٥ بەدەستهێناوە کە لە باڵوێزخانەی ئینگلیز لە ئێراندا کاری دەکرد ، یان لەئەو سەفەرانەیدا کە لەگەڵ ئێرانییەکان لەوانە میرزا ئەبولحەسەن خان ناسراو بە ئیلچی هەیبووە بەدەستهێناوە.

کتێبی حاجی باباکەی لە ئەفسانەکانی خۆرهەڵاتییەکان دەچیَ و ڕووداوەکان بە شێوەیەکی برەودار و شیرین و ڕاپۆرتێکی ڕاستەقینە لە ژیانی ئێرانییەکانی سەدەی نۆزدە نووسراوە، بە شێوەیەک پاش تێپەڕبوونی ساڵانێکی زۆر هێشتاش خوێنەری هەیە.

بنەبابی نووسەر لە پرۆتستانەکانی فەرانسا بوون کە لە ئاکامی بیانووگرتن و بیَ ئاوەزیی هاونیشتمانە دەمارگیرەکانیان بە ناچاریی لە فەرانساوە بۆ ئاسیای بچووک

کۆچیان کرد. ئایزاک بابی مۆریە لە ئەزمیردا لەدایکبوو و لە گەورەساڵیدا بووە هاونیشتمانی ئینگلیز، لە هاوسەرە هۆڵەندییەکەی چوار کوڕی بوو کە جیمس مۆریە دووەمینیانە. بۆ فێربوونی زانست جیمسیان ناردە ئینگلستان، ئەو پاش تەواوکردنی قۆناخی پەروەردەیی گەڕایەوە ئەزمیر و لەئەم شارەدا دەستی بە کار کرد. (لە ساڵی ١٨٠٣بابی ببووە کۆنسولی ئینگلیستان و چووە ئەو شارە.

سرهارفۆرد جۆنز سیاسەتمەداری ئینگلیزی کە چەند ساڵێک لە بەغدا ئیلچی ئینگلیز بوو وهاتووچۆی ئێرانی دەکرد و ئاشنایەتی لەگەڵ بنەماڵەی زەندییەکاندا هەبوو، لە ناوچوونی ئەم بنەماڵە و سەرهەڵدانی قاجارییەکانی بۆ سەرتەختی پاشایەتی دیتبوو. لە ساڵی ١٨٠٧دا هاتە ئیستانبوول. ئەوکات کە جیمس مۆریەی ٢٧ ساڵان بە هۆی بێکارییەوە لەگەڵ بابی دەژیا، گەلێک ئارەزووی چوونە ئینگلییستانی هەبوو، سر هارفۆرد جۆنز ئەوی بردە ئینگلیستان. هاوکات هارفۆرد جۆنز لە لایەن دەوڵەتی ئینگلیستانەوە پلەی بارۆنتی وەرگرت و بە ناوی سر هارفۆرد جۆنز و پلەی وەزیری خاوەن ئیختیار و ئیلچی تایبەت بەرەو ئێران بەڕێکەوت و جیمس مۆریەی لاویشی وەک سکرتێری تایبەت لەگەڵ خۆی برد.

جیمس مۆریە لەگەڵ هاوسەفەرەکانی سر هارفۆرد جۆنز لە کۆتایی ساڵی ١٨٠٨دا بەڕێکەوت و لە ڕێگەی خەلیجی فارس، شیراز و سپاهان لە فۆریەی ١٨٠٩ گەیشتە ئێران و شەش مانگ پاش ئەوەی کە سر هارفۆرد جۆنز پەیماننامەی ئێران ئینگلیزی واژۆ کرد. لەگەڵ میرزا ئەبولحەسەنی شیرازیی لە ڕێگەی تاران ـ تەورێز، ئەرزرووم، توقات، قوستەنتەنییە و ئەزمیرەوە بە کەشتی گەرایەوە ئینگلیستان.

جیمس پاش چەند مانگ مانەوە لە ئینگلیستان لە لایەن دەوڵەتی ئەو وڵاتەوە وەک سکرتێری سر گواوزلی سەفیرکەبیرێکی دیکەی ئینگلیستان هەڵبژێردرا، لەگەڵ ئیلچی و میرزا ئەبولحەسەنی ناوبراو لە مانگی ژوئیەی ١٨١٠ بە کەشتی لە ڕێگەی خۆرئاوای ئینگلیستان، ئەمەریکا، ئۆقیانووسی مەزن و ئۆقیانووسی هیندی گەڕایەوە ئێران، لە ماوەی ئەم سەفەرە هەشت مانگەیدا، جیمس مۆریە بە هۆی هاوڕێیەتی و هاودەمی لەگەڵ هاوسەفەرە ئێرانییەکانیدا و سەرنجدانە شێوەی هەڵسوکەوت و هزری ئەوان لە بواری خەڵک ناسی ئێراندا زانیاریی زۆری بەدەست هێنا.

مۆریە و هاوسەفەرەکانی لە سەرەتای ساڵی ۱۸۱۱دا گەیشتنە ئێران، سر هارفۆرد جۆنز ئیزنیدا و سر گواوزلی لە ئێراندا بە ماوەی چوار ساڵ دەفارەتخانەی ئینگلیسی بەڕێوەبرد، کاتێکیش ویستی بگەڕێتەوە ئینگلیس، جیمس مۆریەی لە پلەی جێگری باڵوێزی ئینگلیز لە ئێران هێشتەوە.

موورەیە تا سێپتامبەری ۱۸۱٦ لە ئێران مایەوە و لەئەو مانگەدا گەڕایەوە ئینگلیستان و ئیدی هەرگیز نەگەڕایەوە ئێران. کەوایە لە سەفەری دووەمدا پێنج ساڵ و چەند مانگ لە ئێران بوو، بەسەریەکەوە کەمتر لە شەش ساڵ لە ئێراندا ژیا.

## زەینی لێتۆژیی و پەیدۆزیی نووسەر و شێوەی کارەکەی

سالآنێک پێش هاتنی جێمز مۆریە بۆ ئێران، شارەزا و زانایانی خۆرئاو بۆ ناسین و بەدەستهێنانی زانیاری زیاتر لە هەڵسوکەوت و شێوەی ژیانی خەڵکی خۆرهەڵات هاتوچۆیان بۆ ئەم وڵاتانە دەستپێکردبوو. لەئەو کاتانەدا کە هێشتا ئۆتۆمۆبێل و ماتۆڕ یان کەرەستەی هاتوچۆی ئاسان و خێرا نەبوو، گەڕیدەیی کارێکی تاقەت پڕۆکێن بوو، ڕەنج و سەختی زۆری لەگەڵ بوو، کەم کەس دەیتوانی کاری وا قورس و پڕ زەحمەت بکات، بە بێ ئەوەی لەژێر پشتیوانیی مادی و مەعنەوی ڕێکخراوێکی تایبەتدا بێت، هەر بۆیە دەبینین کە زۆربەی گەڕیدەکان، بەکرێگیراوانی سیاسەت، ئابووری یان ئاینەکان هەناردەی ئەم وڵاتانە کراون، بەڵام خاڵی سەرنج ڕاکێش ئەوەیە، کە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم کەسانە کاسەی لە ئاش گەرمتر نەبوون، بۆ چارەسەری دەردەکان و لەنێوبردنی کەموکوورییە بێ ئەژمارەکانی خۆرهەڵاتییەکان دەستیان نەداوەتە ئەم سەفەرانە. لەڕاستیدا زۆربەیان بەرلەوەی بەکرێگیراوی سیاسی یان کاربەدەستی لایەنێک بن، زەینێکی پەیجۆر و پەیدۆزی زانستییان هەبووە، لەوانەشە لە بنەڕەتدا بیر و ناوەرۆکی سەرەکییان ناسین و بەدەستهێنانی زانیاریی لە نهێنییە تازە و نەناسراوەکانی ئەم جیهانە سەرنج ڕاکێشە پڕ لە ڕاز و نهێنی ـ یان ئەم لانکە کۆنە و پرتووکاوەی مرۆڤایەتی ـ لای ئەوان پتر لە هەر شتێکی دی بایەخی هەبووە و هەر ئەم تایبەتمەندییە بەهادارەیە کە ناپاکییە سیاسیەکان، یەکلایەنە ڕوانینەکان و بیرتەسکییەکانی ڕوشتی بەکرێگیراویی و نۆکەربوونیان دەشواتەوە، تایبەتمەندیی

دیکەیان لەوەدایە قەڵەمەکەیان لە خزمەت داو و دەزگە حوکومییەکان یا ڕێکخراوی چەپەڵی (سەرڕەرۆیی خۆرئاوا)دا نەبووە، بەتایبەت چونکە ڕووی دەمیان بە تەواوەتی لەگەڵ خوێنەرانی فەرهەنگیی بووە، ئەزموونەکانی خۆیان و ئەوەی دیتوویانە بەپێی لێکدانەوە و هەڵێنجانی خۆیان بە پێچەوانەی نووسەرانی ئێرانی، بە بێ ترس لەئەو ڕێکخراوە شەیتانییە دەنووسی. هەربۆیە پەردەیان لە زۆرێک هۆی بەرگریکەر و ڕووخێنەر، کە پاش سەرهەڵدانی توانایی و سەربڵندییەکان، دامێنی خۆرهەڵات بەتایبەت ئێرانیەکانی_ کە لەئەم گۆشەیەی جیهاندا ڕۆژگارێک لافی سەروەری و پێشەنگییان لە پانتایی شارستانییەت و فەرهەنگی جیهاندا لێدەدا ـ گرتبوو، لادا و چەندین ڕاستیی گرینگیان لە چۆنێتیی سەردەم و ئاکار و خوو و ڕەوشتی ئەم خەڵکە بەتایبەت کاربەدەستەکانیان نووسی و لە نەمان ڕزگاریان کرد کە ئەگەر هیمەتی پیاوانەی ئەوان نەبوایە لەوانەیە ئەم زانیارییە هەڵبژێردراوانە کە لە ڕوانگەی خۆرهەڵاتیانەوە گەلێک بێ چاو و ڕووانە و لە وتن نەهاتوو دەهاتە بەرچاو بە تەواوەتی لە گەنجینەی بیرەوەری مێژووی جیهاندا وون و لەناو دەچوو.

## چەند نموونەیەک

## لە زانیاریی و بیر و باوەڕ و هەڵێنجانەکانی نووسەر

کاتێک نووسەر هاتە ئێران هێشتا لاوێکی (٢٨ ساڵە) بوو بە پێی پاڵنەری تامەزرۆیی و هەستی لاویەتیی و هەلومەرجی سەردەم، گەوهیدەری ئەم پارچە هەڵبەستەی سەعدییە: جوویەک و موسوڵمانێک مقۆمقۆیان بوو و هتد... پارێزەری ئاینی خۆی (ئاینی مەسیح) بوو و بە خوو وخدەیەکی وەک قەشەکان، هەربۆیە لە کاتی نوێژ و پاڕانەوە و مەرگی هاوسەفەرەکانیدا، پێشنوێژیی دەکرد و ڕێورەسمە ئاینیەکان لە ئەستۆی ئەو بوو. هەروەک لەسەر تەرمی هەندێکیان نزای تایبەتیی ئەو جۆرە ڕێورەسمانەی دەخوێندەوە. ڕێوڕەسم و نوێژ و پارانەوەکانی ڕۆژانی یەکشەمە تەرک ناکرێت، بە پێداگرییەکی زۆر و وردبینی ئەم کارانەی لەنێو خێوەتی ئیلچیدا ئەنجام دەدات، لە جێگەیەکدا دەڵێ: سەرەڕای تەڕاتێنی تۆفان، دەسبەرداری بەجێگەیاندنی نوێژ و سوپاسگوزاریی لەئەو نیعمەتانەی کە بە ئێمە دراوە نەبووین، تەراتێنیی ئەو تۆفانە لە دەوروبەرمان تەنیا پیرۆزیی پتری بە ڕێوڕەسمەکانمان دەدا، جارجارەش وەک سەعدی لە ئاوازی پەلەوەرەکاندا سروودی ستایشی پەروەردگاری دەبیست: (ئاواز خوێندنی پەلەوەرەکان لە بەرەبەیاندا و ڕێپێوانی بە کۆمەڵی ڕەوەکان لە دەشتدا شکۆیەکی وای بە تازەیی بەرەبەیان دابوو کە خامە توانای نووسینی نییە، دەتگوت کە سەرانسەری دنیا ستایشی ئافرێنەر دەکەن). گەر وەک لە پێشەکی کتێبەکەدا ئاماژەی پێداوە، کارەکانی پتر ڕوانگەی ئاینی هەیە و دەیەوێ ئەوەی لە وڵاتانی خۆرهەڵاتدا دەیبینێ لەگەڵ بابەتەکانی کتێبی پیرۆزدا بەراوردی بکات و

بەڕاستیی لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری لەئەمبارەوە ئەنجام بدات و هەر بۆیە لە کتێبەکەدا جار نە جارێک و بەپێی پێویست و بەجێ چەند ئایەتێک لە کتێبی پیرۆز دەهێنێتەوە. بەسەر یەکەوە نووسەر بە تێڕوانینێکی شایستە تەماشای خەڵکی ئێرانی کردووە، هەرچەند بە گوتەی خۆی، قسەکانی تێگەیشتنێکی توند و ڕووکەشانەیە لە دیتنی ئەو دیمەنانەی ئێران، گەر وەک گەڕیدە ئەورووپییەکان بە هەر شێوەیەک ڕووداوەکانی دیتوە، نووسیویەتی. هەست و سۆزەکان و ڕەتدانەوەکانی خۆی لە هەڵسوکەوتی دڕندانەی کاربەدەستان و ژێردەستەکانیان بە خەم و بێزارییەوە نووسیوە. هەروەها لێکۆڵینەوەکەی هەروەک گوترا لە لایەکەوە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریی نێوان بینتراوەکانی ئەو لە ئێران و نووسراوەکانی کتێبی پیرۆز، چونکە زۆرێک لەئەو ڕووداوانەی کە لە سەردەمی فەتح عەلی شای قاجاردا ڕووی دەدا لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی کە دەیان سەدە پێشتر یان سەردەمی کۆمەڵگای کۆن ـ سەردەمی کەونارا ـ نووسەرانی کتێبی پیرۆز لێی دوواون بەراوردی کردووە، لە لایەکی تریشەوە دواکەوتنی لە کاروانی شارستانیەتدا، ستەمکاریی، نەبوونی دادپەروەری لە کۆمەڵدا، زاڵبوونی فەلسەفەی زۆر بەسەر زەین و هزر و ڕەسەنایەتی و سروشتی دووەمین بوون، ئەم دەرد و بەڵایانەی ئاشکرا کردووە. پوختەی قسەکانی ئەوەیە کە ڕێز و ئازادی و تەناهیی ماڵیی و گیانیی خەڵکانی ئێران بەردەوام لەژێر هێرش و شاڵاو و لەناوبردندایە. هەموو فەرمانبەرێکی بێ عەقڵ دەتوانێ تێیانهەڵدا و هەموو جۆرە جنێو و قسەی ناشیرین و ئازارێکیان بدات، تەنانەت ڕشتنی خوێنیشیان بە ڕەوا بزانێت. فەلاقەکردن و چەندین جۆری ئازار و ئەشکەنجە، دەستدرێژی کردنە سەر ماڵ و دارایی و نامووسی خەڵکی لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە ڕەوایە، کاربەدەستان و دەسەڵاتداران تەنیا لە هزری دەسەڵاتداریێتی و پارێزەری دروستیی، خۆڕاگریی، سەلامەتیی، تەندروستیی، بەختەوەریی، هەرمان و خۆراگریی خەڵکدا نییە، دامەزراو و بونیاتێکە جودا لەئەوان، مارە ئەفسانەییەکانی ئاژیدهاکە کە خۆراکی لە گیان و ماڵ و توانایی خەڵکەکەیە، چەوسێنەر و دیل دروستکەرە. خەڵکیی ئاگاداری ناسینی ماف و سنووەکان و مافە تایبەتییەکانی مرۆڤانەی خۆیان نین، نیمچە وەحشی، نائاگا و ڕەمەکی دەژین. هەرماوەیەک سەربزێوێک ئالایەکی هەڵدەدا و زۆرێک بێژوو و بەدخوا لە دەوری

ئالاکەی کۆدەبنەوە و لەگەڵ ئەو خەریکی ڕاوەڕووتی خەڵکی دەبن، بە ئەم شێوەیە لۆژیکی زۆر و ستەمگەری ڕۆڵ و زنجیرەی دەسەڵاتی خۆی لە بابەوە بۆ کوڕ و لە پێرار و پارەوە بۆ ئەمساڵ ڕادەگرن. دەنگی ئازادیخوازیی و ماف خواستن هەر لە سەرهەڵدانیدا دەخنکێنن، پتری ئەو وێرانکارییانە ئاکامی شەڕانخێوی و دزی و هێرش و شاڵاوی ئەم چاوچنۆک و تینووی دەسەڵاتە: (بەڕاستی کەلاوە چۆڵەکان لە خەڵکی ئاوارە لە سەرانسەری ئەم وڵاتەدا بە ئاشکرایی و ڕوونی لە ئاسایش و بەختەوەریی و ئاوەدانی لەمەوپێش و وێرانی ئەمرۆی دەدوێ، بەڵام لەئەم ناوچەیەدا هۆیەکانی ڕاستەقینەی وێرانی لەناوچووە، چونکە ئەم هۆیانە ئاکامی ئەو وێرانکاریانە بوون کە شەڕە درێژخایەن و پەیتا پەیتاکانی بنەماڵەکانی زەند و قاجار دروستی کردن، ئێستەش بە سەرکەوتنی قاجارەکان تەواو بووە)، (بەڵام وێرانەکان سەرەڕای نەمانی ئەو هۆیانە هێشتاش ئاوەدان نەکراونەتەوە).

خەڵکی بە یەکجارەکیی لە مێژوو و ڕابردووی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە و شکۆ و گەورەیی و توانایی باب و باپیرانی خۆیان لەیاد کردووە، شوێنەوارە پرشکۆ و مێژینەکانیان بەهی زەردەشتی و کافرەکان دەزانن، هەر بۆیە سەرنج و ئاوڕێک لە کاری توێژەرەکان و لێکۆڵەران و کۆنینەناسە بێگانەکان نادەن، کە هەندێکجار خەریکی توێژینەوە و دۆزینەوەن، شوێنەوارە لە مێژینەکانی ئێران لەئەم وڵاتە دەبەنە دەرێ. ـ هەر لەئەم کتێبەدا دەبینن کە نووسەر هەندێک لەئەم شوێنەوارە دۆزراوانە بە بێ هیچ گرفت و دژوارییەک دەنێرێتە وڵاتەکەی خۆی ـ .

تێچووی میوانەکان و کاربەدەستە سیاسییە بێگانەکان کاتی تێپەربوون بە دێهات و شارەکانی سەر ڕێگە لە ئەستۆی خەڵکی ئەو جێگەیانەدایە، کە دەبوو سوور و سات و پێداویستییەکانی دیکەی میوانە حکومییەکان دابین بکەن، میواندار فەرمانبەرێکە بە نووسراوێک لەلایەن شاوە، کە بە هەبوونی ئەو بەڵگەیە دەتوانێ هەرچی بوێ لە خەڵکی شوێنە جیاجیاکانی وڵات وەرگرێت. هەربۆیە پیاوانی دەستکورتی هەندێک لە گوندەکان کاتێک ئاگاداری نزیکبوونەوەی میواندار و هاوسەفەرەکانی دەبوون، بۆ ڕاکردن لە دانی خەرجی قورسی ئەوان گوندەکانیان چۆڵ دەکرد و پەنایان دەبردە بەر کێوەکان، بەڵام میواندار دەسبەردارنابێت و لە دەرگای ماڵەکانیان دەدات و

هەرچییەکیان هەیە بە زۆر لە ژنەکانیان وەردەگرێ، تەنانەت لە بەڕە و ڕاخەر و شتە کەمنرخەکانیشیان چاوپۆشی ناکات، ئەم ژنە بێچارە و دەستکورتانە لە ماڵەکانیان دێنەدەر و لە بەرانبەر ئیلچی ئینگلیسدا دەست بە شیوەن و گریان دەکەن و ڕێگەچارەیەکیان دەوێ، بە جۆرێک کە جارێکیان ئیلچی دڵی بە حاڵیان سووتا و خۆی تێچووی هاوسەفەرەکانی بە ئەستۆ گرت. شەلاخدان لە تەوقی سەری خەڵکیش مافی تایبەتیی میوانداره، زۆرێک لە خەڵکیی بۆ دیتنی ئەورووپییەکان لەسەر ڕێگەی ئیلچی کۆ ببوونەوە و وەک ئاژەڵ بە دەست و پێ سواری کۆڵی یەک دەبن و میواندار بە شەلاخ لە تەوقی سەریان دەدات تا بڵاوەیان پێ بکەن، و ڕێگەکە بکەنەوە. ئەمانە لە ئاکامی ستەمی بەردەوام و ڕاوەرووتە هەمیشەییەکانی دەسەڵاتداران، دەستەنگن، هەر بۆیە وەک نیوە جانەوەر، گەدائاسا و لاواز و بێ توانا و داماو بوون.

لە دیرووس ـ گوندێک لەسەر ڕێگەی بووشەهر ـ ئیلچی ئینگلیس لەنێو ژمارەیەکی زۆر لەئەم خەڵکە لاواز و چاوبرسییەدا کە لەسەر ڕێگەکەی کۆببوونەوە هەندێک پارەی هەڵدا، ئەمانە (بە ورووژاوی و چاوبرسییەتی و نەدیدەیەکی زۆر ترسناک و بە پەلە هێرش بۆ پارەکە دەبەن و بۆ فڕاندنی لە دەستی یەکدی لە خاک و خۆڵدا تل دەخۆن و دیمەنێکی شەرمهێن پێکدەهێنن، هاوکات لە میوانییە یەک لەدوا یەکەکانی کاربەدەستەکان کە بە شانازی هاتنی ئەم دەستە بێگانەیە ڕێکی دەخەن، فرەوانیی خۆراک و شیرینی و میوە جۆراوجۆرەکان لەسەر خوانە ڕەنگینەکانی حکوومەتیی کە لەئەم خواردنگە بەرفرەوانەدا لەسەریەک دادەنرێت، ئەوەندەیە کە لە باسکردن نایەت، مەودای ژیانی خەڵکی لەگەڵ کاربەدەستەکان مەودایەکی لە زەوی تا ئاسمانە. دەستکورتیی، ترس و خۆف، زەبوونی، نەداری، سەردانەواندن و بەندەیی، لە ئاکامدا مەرگ هەموو ئەو شتانەیە کە وەک ژەهرێکی کوشندە ڕژاوەتە ناو ڕەگ و خوێنی خەڵکی، هەموو ئەو شتانە دەبنە هۆی ئازادەیی، جوامێری و سەرفرازی لێ ئەستاندن، کۆمەڵگای ئێران کۆمەڵگەیەکی نەخۆش، ستەملێکراو و دەسەڵات سەپێنراوە.

هەندێک لە هەڵێنجانەکانی نووسەر سەبارەت بە چۆنیەتی ژیانی مادیی و مەعنەوی ئەم دوو دەستەیە ـ دەسەڵاتدار و ملکەچ ـ بە ژمارەی ڕیزبەندیی یەکەم و دووەم لە خوارەوە دەهێنرێتەوە تا مشتێک لە نموونەی خەروارێک بێت. یەکەم پیشاندەری کاربەدەستان یان کەمینەیە و دووەم پیشاندەری خەڵکیی یان زۆرینەیە:

یەکەم ـ زۆر گاڵتەجارییە ئەو کاتەی کە دەبینی پیاوێک بە شکۆ و مەزنییەوە لە بارەگەی خۆیدا لەنێو دەستەیەکی بێ ئەژمار لە نۆکەر و خۆتێهەڵقورتێن و دەمتەڕ دادەنیشێ، پاش ماوەیەک هەر کەسە و بە نۆبەی خۆی ئەو تەڕزمانیانەی، کە لە یەکێک لە نۆکەرە نەفامەکانی لە بەرانبەریدا ئەنجامیداوە لە بارەگەی شادا دووپاتە دەکاتەوە.

دووەم ـ من لەگەڵ کەسێکی خەڵکی مازەندەران قسەم دەکرد، ئەو بەهەمان ڕادە کە پێناسی خووخدە و کرداری چاکی خەڵکی زێدەکەی دەکرد، گلەیی لە کاربەدەستان هەبوو، هەموو شتێکیان لێ زەوت کردبوو و وەسواڵکەرییان خستبوو، بەڵام وەک دەیگوت زۆرێک لەئەم هاوشارییانەی چوونەتە هیندوستان و لەئەو وڵاتەدا گونجاون و بەهۆی لێهاتوویەکانیانەوە بە سامان و ناوبانگ و نان و ئاوێک گەیشتوون.

یەکەم ـ لێرەدا فەرمانبەرێک لەلایەن شازادەی دەسەڵاتدارەوە بۆ بەخێرهاتن پێمانگەیشت، کە دە پازدە پیاوی لەگەڵ بوو، ئەسپێکی زینکراوی لە پێشەوە بوو، کە دەستەکەمان چاویان بە ئەوان کەوت دیمەنێکی پێکەنیناوی بوو، کە دەماندیت هەر کەسە و چۆن بچووکترین پارچە زێڕ و زیوی خۆی لەبەرکردبوو تا ببێتە هۆی ڕێزلێگرتنیان.

دووەم ـ لە سەرانسەری ڕێگەدا دار زۆرکەم دەستدەکەوێت، خەڵکی بێ نەوا ناچارن بۆ بەدەستهێنانی پێداویستییەکانیان بپاڕێنەوە و بە گشتیی جلوبەرگیان زۆر شڕە.

یەکەم ـ کاتێک لە پایتەخت بووین یەکێک لەئەم ڕووداوە شادیهێنەرانە ڕوویدا، لە یەک شەودا شەش ژن، لە ژنەکانی شا دووچاری ئازاری منداڵبوون ببوون و چوار کوڕ و دوو کچیان بوو.

شا شەست و پێنج کوڕی هەیە و لەبەرئەوەی ئێرانیەکان باسی کچەکانیان ناکەن ژمارەی کچەکانی شا ڕوون نییە.

دووەم ـ جەعفەر عەلی کارگێڕی سیاسی ئینگلیز لە شیراز بە منی گوت، کە لە ئێراندا ژمارەی زەردەشتییەکان ساڵانە کەم دەبێتەوە، حکوومەت بە شێوەیەک سووکایەتییان پێدەکات یان دەیانخاتە ژێر فشارەوە، کە لە ڕووی ناچارییەوە دەبنە موسوڵمان یا دەچنە هیندستان بۆ لای برا فارسەکانیان......

... ئێستە یەزد گەورەترین جێگەی نیشتەجێبوونیانە، بەڵام بە سەختیی دووچاری سووکایەتی و بێ دەرەتانین و لە جوولەکەکانی عوسمانی بەدبەختترن و شایانی دڵسۆزی و بەزەیین.

یەکەم ـ پاشان کاتی واژۆکردنی پەیماننامەکە دەستی پێکرد، سەرەتا میرزا شەفیع سەدرەئەعزەم قەڵەمەکەی بە دەستەوەگرت و ناوی خۆی و براکەی، نوێنەری تایبەتیی و هەمەکارەی ئێران، کە نەیدەزانی ناوی خۆی بنووسێت لەژێر پەیماننامەکەدا نووسی.

دووەم ـ بەگشتی ئێرانیەکان لە وڵاتانیدیکەی جیهان بێئاگان.

یەکەم ـ ئەعلاحەزرەت (فەتح عەلی شا) زۆر خۆمانە قسەی دەکرد، پرسی: لە یەنگەی دونیا واتە دونیای نوێ کە ئەمریکای پێدەڵێن چ خەبەرێکتان هەیە؟ چ جۆرە شوێنێکە؟ ئایا لەژێر زەویدایە یان بەشێوەیەکي دیکە؟ پاشان لە حکوومەتەکەی ئێمەی پرسی وەک بڵێی دەزانێ پاشاکانی بەریتانیا بە بێ دەستێوەردانی پەرلەمانەکانیان ناتوانن کارێکی وەها ئەنجام بدەن، پاشان کە هەندێک ڕوونکردنەوە لەئەم بارەوە درا، شا بە ئاشکرا سەری سووڕما بوو، کە چۆن دەکرێ دەسەڵاتی پادشا سنووردار بکرێت.

دووەم ـ میواندار ئەو خەڵکانەی کە فەرمانەکانیان بەڕێوەنەدەبرد بێبەزییانە شەلاقکای دەکرد.

یەکەم و دووەم ـ دووەمین وەزیری پادشا (فەتح عەلی شا) بە دڵنیاییەوە دەیگوت لە کاشان بیرێکی لێیە ـ ئێمە نەمانبینی ـ کە مرۆڤ بە شەش مانگ دەگاتە بنەکەی، لە قۆناخە جیاجیاکانی چوونە خوارەوەی ئەم بیرەدا مرۆڤ بە دەشت و ڕووبارگەلێک دەگات، هەندێک کەس چوونەتە نێو ئەو بیرە و قەت نەگەڕاونەتەوە. ئێرانیەکان باوەڕ

بە ئەم ئەفسانانە دەکەن، بەڵام باوەڕ ناکەن کە شەقامەکانی لەندەن شەوانە ڕۆشنە یان ئەوەی کە لەئەورووپا خانووی وای لێیە کە حەوت نهۆمی هەیە.

یەکەم ـ سەرانسەری تەلاری بارەگەی ناساندنی ئێمە بە خزمەت شا، ئاڵدۆز و وێنە کێشراو بوو، لەلای چەپی پەنجەرەیەک تابلۆیەکی گەورە شەڕگەی ئێران و ڕووسی پیشان دەدا، کە لەئەودا شا بە باڵانوێنی سواری ئەسپێکی سپی بووە و گەورەترین پیاوی گۆڕەپانی شەڕە. هەڵبەت لەئەم تابلۆیەدا بە سەرکەوتوویی و سەختی خەریکی کوشتاری ڕووسەکانە وەک بڵێی ڕاوێکی ئاسانیان چنگ کەوتووە، لە دوورترین جێگەی ئەم تابلۆ ڕەشەدا ڕووسەکان لە گۆڕەپانێکی ڕووتەندا خەریکی تەقاندنی تۆپ و تفەنگن بەبێ ئەوەی سوود و قازانجێکی ئاشکرایان هەبێت.

دووەم ـ پاش ئەوەی نزیکەی سێ پاڵەوانی زۆرانباز بە پانتۆڵی کورتی ڕەنگاورەنگەوە (تەنیا پۆششی ئەوان) بە جووتێک گورزی گەورەوە بە ناوی (میل) هەریەکە و بە هاندانی سەرسووڕهێنەرترین هات و هاوار بە شێوەیەکی زۆر بێ ئەقڵانە دەکەوتنە گورگەلۆقە و لە پێش ئەسپەکانی ئێمەدا لە سەرانسەری ڕێگەدا کە تا ئۆردوگا هونەری خۆیان دەنواند زۆر بە سەختیی دەکرێ دەستەیەکی ئاوا دڕندانە و تێکەڵپێکەڵ بناسێنرێت. لەراندنەوەی لەش، ڕاکردن، پاڵنان و هەڵخستنەوەی بێ شومار، کەم و زۆر گێژی کردم.

یەکەم ـ لە ئێراندا ئومێدی ئەوە هەیە، کە تا ساڵانێکی زۆر ژمارەیەکی کەم لە بینا مێژووییەکان بمێننەوە، چونکە ئەو کاربەدەستانەی کە پاش دروستکەرانی ئەم بینایانە دەسەڵات دەگرنەدەست دەیانەوێت تەنیا خۆیان بنیاتنەر بن و بە جێگەی پارێزگاریی لەئەو بینایانە و شانازیکردن بە ئەم یادگارە مەزن و شکۆمەندانەی ڕابوردوانیان، تەنیا ڕەنجی وێرانکردنی ئەوانە بە ئەستۆ هەڵگرن تاکو بە خشت و بەرد و کەرپووچ و داری ئەوانە بینای نوێ چێ بکەن، هەروەها ناوی خۆشیان لەسەر بیناگەورەکان دادەنێن، هەرگیز باوەڕیان نییە کە تەمەنی ناوبانگیان پاش مەرگ تا چ ڕادەیەک کورتە، ئەم ڕێوشوێنە ڕەخنەی کردووەتە ناو ژیانی تایبەتیی خەڵکی ئاساییش و بەڵگەش بۆ ئەوە ئەوهەمووە وێرانەیە کە لە دەوروبەری شارەکاندا دەبینرێت.

فەتح عەلی شا دەسەڵاتداری ئێستە، پێش گەیشتن بە تاج و تەخت سوێندی خورادووە کە ئەگەر ببێتە دەسەڵاتدار بینای زۆر لە شاری قومدا درووست بکات و خەڵکەکەشی لە دانی باج

ئازاد دەکات، لە پابەندبوون بە سوێندەکەی قوتانخانەیەکی گەورەی لە تەنیشت مەزاری خوشکی ئیمام ڕەزادا (د.خ) دروستکرد و پشتگیرییەکی زۆری خوێندکارەکان دەکات، گ وم بەزیمەزارگەکە شی زێ رک فت ک رد (کاشییە بریقەدارەکانی لابرد) و دەڵێن ساڵانە بری سەد هەزار تمەن بۆ ڕازاندنەوەی دەدات، دیسانیش دەڵێن ئەم مەزارگەیەش داهاتی زۆری هەیە، کە بە ئەو گەوهەرانەی کە ژنانی شا و کاربەدەستانی دەزگاکانی دەوڵەتی ساڵانە پێی دەدەن پتر دەبێت.

دووەم ـ سەرانسەری ئەو شوێنەی کە لێیەوە تێپەردەبووین (گزوسینی نزیک ئەسفەهان) خەڵوەت و بێ دەنگ و خەڵکی تێدا نەبوو، بەڵام وێرانەکانی ناوچە جیاجیاکانی پیشانی دەدا، کە ڕۆژگارێک خەڵکانێک لەئەو ناوچانەدا بە شادی و خۆشی ژیاون.

زەرقان لە یەکەم نیگادا جێگەیەکی ئابروومەند دەهاتە بەرچاو، دیوارێکی گڵی بە دەوردایە، بەڵام چونکە زۆر شوێنی دیوارەکە وێران بووە، بە ئاسانی دەکرێ ببینرێت، کە بەشی زۆری خانووەکانی ناو قەڵاکە تەنیا توێکڵێک لە خانوون و خاوەنەکانیشیان لەگەڵ نمای خانووەکاندا گونجاو و تەبان و خەڵکانێکی چارەڕەشن.

یەکەم — دەرچووی باج دڵخوازە و بۆ گوندنشینەکان زۆر قورسە، لەئەم باجەدا زیادسەندنی زۆر هەیە و ژیانی جووتیاران گەلێک ئاڵۆز و خراپ دەکات. ئەم باجە لە کاتی تایبەتدا وەک تێپەڕبوونی هەر یەک لە کاربەدەستانی دەوڵەت و ژێردەستەکانیان لە شوێنە جیاجیاکانی وڵات بۆ دابینکردنی بڕی پێداویستیە ناوچەییەکانیان یان لە هەلی دیدا کە زۆرجا ڕوودەدات لە گوندنشینەکان وەردەگیرێت بە شێوەیەک کە گوندنشین هیچکات باوەڕی نییە کە ماوەیەکی کورت بە ئاسوودەیی بژیت.

دووەم — گوندنشینەکانی (سورمەق) جلوبەرگی شڕە و پڕە و ڕواڵەتێکی نەدارانە و چارەڕەشانەیان هەیە. سەفەرکردن بە شێوەی ئێستەی ئێمە لەگەڵ زۆرێک لەئەو کەسانەی لەگەڵمانن ناهێڵێت کە دیتنی ئەم وڵاتە بەدبەخت و شارە وێرانانە، وەها کە گەڕیدەیەکی تەنیا دووچاری ناڕەحەتی دەکات، ئێمە خەمبار بکات، چونکە ئەم وێرانانە لە فەرمانبەرانی زۆری ئێمە کە لە هەموو شوێنێک بڵاوبوونەتەوە و لە

دەستەی جۆراوجۆردا سەرقاڵی کار دەبن، گوڕ و تین و شادی تێدەکەوێ و بۆ ماوەیەکی کورت سەرلەنوێ زیندوو دەبنەوە.

لە کاتی تێپەڕین لە کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا خانووە ناحەزەکانی پایتەخت هیچ شتێکمان نەدیت کە نیشانەی پاشایەتی پێوە دیاربێت.

لێرەدا بەڕاستی هەر کوێیەکمان دیتوە ڕواڵەتێکی وا لە تەنگدەستی و نەداری پیشان دەدات کە قەڵەم توانای نووسینی نییە.

لێرە جگە لە ژیانێکی وشک و برینگ و خاڵی و ناشایست، شتێک بەدی ناکرێت، لە دیداری بیرلێنەکراو و کەمتەرخەمی ئێمەشدا دەست بە قووڵایی نەدارییەکانی ئێرەدا ڕانەگەیشت.

یەکەم — میواندارەکەمان بۆ خۆپیشاندان ول پاڵەوانی لێدان ئەسپەکەی بەسەر تەپۆڵکەیەکی بەردیندا غاردا، ئەم کارەی بە شێوەیەک لە شێتی مەزەندە دەکرا.

کاتێک دوو دەستە بە یەک گەیشتین (لەگەڵ دارودەستەی نوێنەری حکوومەتی قاجار) هەموو ئەو زمان لووسی و چاک و خۆشییانەی کە پێشتر لە تاران دیتبوومان بە هەمان شێوە دووپاتیان کردەوە. ئەوان لە خۆیان و حکوومەتەکەیان بە شادی و ڕازیبوونەوە دەدوان، ڕووسەکانیان بە کەم دەزانی، فەرمانبەرێک گوتی: ڕووسەکان وەک سەگ لە ئێمە دەترسن، هەموو شتێکی ئێمە لە هی ئەوان چاکترە ئیدی هەرگیز زاتی ئەوە ناکەن خۆدەرخەن.

دووەم — لە چوار میلی (سیاە دەهان) لە تەنشت ڕێگەدا لە گوندێک بە ناوی کەک وێستاین، خەڵکی گوندەکە، کە لە سەر دیوارەکانەوە تەماشایان دەکردین وەک بڵێی پارێزیان لە هاتنە نێو کۆڵان و بەرەو ڕووبوونەوە لەگەڵ ئێمە هەبوو. لە کۆتایدا کوڕێک هاتە پێشەوە و سەبارەت بە گوندەکە و دەوروبەری پرسیارمان لێکرد، بەڵام وا دیاربوو لە وڵامدانەوەدا شەرمی بە خۆی هەبوو، کاتێک دەفتەرچەی یادداشتەکەمم دەرهێنا بە ڕواڵەتێکی پر لە دڵپیسی پرسی: (خەریکی چ دەنووسی؟) پاشان بەخێرایی هەڕای کرد. ماوەیەکی کورتی پاش ئەوە دەنگە و هەرای دۆستەکانی دەبیسترا کە هاواریان دەکرد (ئەمانە ڕووسن) ، هەڵبەت ئەو خەبەرە دەم بەدەم ڕۆیشت و خەڵکی ترساند.

# چەند نموونەیەکی دی لە هەڵێنجانەکانی نووسەر

١ ـ نووسەر لە تەوریێز میرزای گەورە وەزیری عەباس میزرا دەبینێ و (میدالیای جوامێری) کە بە وتەی ئەو ئێرانی ئەو سەردەم لەنێو کاربەدەستەکان و نۆکەرەکانیاندا گەلێک دەگمەن بووە تەنیا لەئەم پیاوەدا دەبینێ و بە کەسێکی گەلێک جیاوازی دادەنێ کە سەر و گەردنێک لە هەموو فەرمانبەرانی حکوومەتیی ئەو سەردەمە بەرێزترە، شازادە عەباس میرزاش وا دەبێنێ کە لە دادوەری، پیاوەتی و دروستکاریدا بەهرەیەکی زۆری هەیە و هۆگری کتێب، زانست و پێشکەوتن و هەروەها خەبات دژی دواکەوتوویی و داماوی و دەستکورتی بە هۆی نەزانییەوەیە، لە بیری ساماندان، پێشکەوتن و سەرفرازیی ئێراندایە: وەزیر وڵامی دایەوە هیچ شتێک لەئەم دونیایەدا پتر لە کتێب و بەدەستهێنانی ئەم جۆرە شتە بنەڕەتییانە ناتوانێ ئەو و شازادە خۆشحاڵ بکات...

لە دیداری ماڵاوایی لەگەڵ ئێمەدا وەزیر گوتی، شازادە ئارەزوومەندە کە لە مێژووی ئینگلیس ئاگاداربێت و ویستی کە لە گەڕانەوەدا بۆ ئێران هەندێک کتێب سەبارەت بە مێژووی ئینگلیس و هەروەها فەرانسا و ڕووسیا لەگەڵ خۆم بێنم تا ئەوانە لەگەڵ ئەو کتێبانەی کە پێشتر سەبارەت بە ئەم وڵاتانە هەیبووە، هەڵسەنگێنێت.

٢ ـ من خەڵکانێکی سزاوارتر لە ئێرانییەکان بۆ سەربازی ناناسم، ئێرانییەکان تایبەتمەندییەکانی سەربازی ئاوەرتەیان تێدایە، شەکەری ئازا، خووگر بە کار و ڕەنج، بەهێندگرتنی ژیان و پەسندەری جوامێری و بەڕاستیش گەورەترین ئارەزوو و ئامانجیان ئەوەیە کە بە (ئازا و نەترس) ناو ببرێن.

٣ ـ نووسەر لە تەختی جەمشیددا تەپۆڵکەیەک لە چوارچێوەی پەنجەرە و دەرگاکان کە لە بلۆکی مەڕمەڕ و لە ئەندازەگەلێک جواندا کەوتبوون دیتەوە، بێ

ویست لەبەرانبەر گەورەیی و شکۆی ئێرانییەکانی سەردەمی کۆن سەری دانەواندووە و دەنووسێ: (ئەم چوارچێوانە کە لە شوێنکێکی چوارگۆشەدا هەڵرژاون، نیشانەی ئەوەیە کە لێرەدا کۆشکێکی شاهانەی زۆر شکۆمەند بە شێوەیەک کە لەخەیاڵدا ناگونجێت هەبووە. لە هەر لایەکی چوارچێوەکاندا نەخشگەلێک تاشراوە و مەڕمەڕەکان هێشتاش دەدرەوشێنەوە، وەک بڵێی هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ جوانترین ئاوێنەکاندا بەرانبەرکێیان کردووە).

سەبارەت بە چل ستوونی سپاهان دەنووسێ: چەند هەیکەلێک بە شێوەیەک وێنە کێشراو و زەڕکاری کراوە، کە شایانی وڵاتانی پلە یەکەمی شارستانی و شارستانیترین وڵاتانە...ئەم تابلۆیانە لەگەڵ ئەوەی بەبێ کەمترین زانیاریی لە زانستی (دیمەن و ئاوێنە) و دوورنما، نیگارکێشی کراوە، لەگەڵ ئەوەی لە ڕواڵەتەکان بە سەریەکەوە لەگەڵ یەکدا نایەنەوە و چلۆنایەتیان سرویشتی و جوان نییە، بەڵام بە شێوەیەک ڕاستگۆیانە و بەرۆح بوون و تایبەتمەندیی داب و نەریتەکان و خوو و ڕەوشتی ئەو میللەتانەی کە پیشاندەری ئەوانن، دەخاتەروو، کە ئەگەر کاتم هەبوایە تا لە ڕوویان بکێشمەوە، کۆمەڵێکی زۆر گرانبەهام بە نیگارەکانی خۆم زیاددەکرد. ئەگەر بەبیربێنینەوە کە هونەرمەندی نیگارکێش ئەزموونی لێکۆڵینەوەی ئاکادمیکی نەبووە و ماوەی ئەوەشی نەبووە، کە توانایی، بەهرە و زانستی خۆی بە دیتنی گالەرییە گەورەکانی ئەورووپا پەرە پێبدات، یان لەگەڵ پیاوە گەورەکان و مامۆستاکانی هونەردا گفتوگۆ بکات، دەبێ دان بەوەدا بنێین، کە لێهاتوویەکی مەزنیان هەبووە و نیگارە کێشراوەکانی نمونەگەلێکی بەتوانا لە بلیمەتیی ئەم خەڵکەیە... زرەکارییەک، کە بۆ جوانکردنی جلوبەرگ و قاپ و قاچاخەکان هەبووە سەرنجراکێشە کە لەوانەیە هاوتای نەبێت.

بەکورتی نووسەر پیاوێکی ئینگلیزییە، دووجار هاتووەتە ئێران، جاری دووەم لە سەرەتای دووەمین دەیەی سەدەی نۆزدەیەم لەگەڵ ئیلچی ئینگلیس و چەند کەسێک لە میوانەکانی حکوومەتی ئێران لە کەشتیدا بووە، پاش تێپەڕبوون لە چەند وڵات گەشتوەتە ئێران و دیتنەکان و هەڵێنجانەکانی لە شێوەی ژیانی خەڵکی ئێران، چارەڕەشی و بەدبەختی ئەوان لە سەردەمی قاجاردا بە وردی دەنووسێ، لە دزێوییەکان

و چەوتییەکان و درۆزنییەکان، بەتایبەت زمانلووسیی بێ هونەرەکان و ستەمکارییەکانی خاوەن زۆر و چاونەترسەکانی — هەندێجار لەوانەشە زەقتر و زیادەرۆیانەتر پەردە لادەدا و وتەکانی کتێبی پیرۆز لەگەڵ شێوەی هەسوکەوتیان بەراورد کردووە و هاوتاییەکانی پیشان دەدات و زۆداری و ملهوڕی و ستەمکاری کاربەدەستان و نەبوونی ئازادی، درۆزنی، بتسازی، تاکپەرستی، ڕەوا نەبوونی ڕاستگۆیی و نیازی زۆردارەکان بە زمان لووسی و تۆمەتلێدان ئاشکرا دەکات. بۆ نموونە دەڵێ کە کاربەدەست و بەرێوەبەری مووچەخۆرێک کاتی تێپەڕینی فەتح عەلی شا لەئەم گوندەوە، بۆ بەهرەمەندبوون لە یارمەتی یان وەک دەڵێن، مشوورلێخواردنی شا، کوڕەکەی خۆی تا ناوقەد ڕووتکردبووەوە. وەک ئیبراهیم چەقۆیەکی دەم تیژی بە دەستەوە گرتووە و لە کاتی تێپەڕینی شادا دەیدا بە زەویدا و داوا لە فەرمانرەوای دیکتاتۆر دەکات تا مۆڵەت بدات منداڵەکەی لەبەر پێی شادا سەرببرێت.

بەسەریەکەوە نووسەر خەڵکی ئێران بە هۆی نەبوونی ئازادی و ئازادنەبوونەوە بە خەڵکێکی دواکەوتوو، زوڵملێکراو، درۆزن، زمانلووس و بتساز ئەژمار دەکات، هەڵبەت هەندێکجار چاکییەکانیان و توانا فرەوانەکانیانی فەرامۆش نەکردووە، هەندێک جار دەڵێ ئەگەر ئەم توانایانە بە شێوەیەکی دروست پەروەردە بکرێن ئەم وڵاتە بە باشی پێش دەکەوێت، ئەو کاتی گەڕان و لێکۆڵینەوە لە شوێنەوارە کۆنەکانی ئێران، لەئەوەی کە خەڵکی ئێران بە یەکجارەکی لە مێژوو و ڕابووودووی خۆیان دابراون و ئەو شوێنەوارانە بە هی زەردشتییەکان دەزانن، زۆر سەری سووڕماوە، بە هەرحاڵ وادیارە هیچ داستانێکی خەیاڵی و هیچ ڕۆمانێک ناتوانێ بەرادەی ئەم جۆرە سەفەرنامانە زانیاریی و ئەزموون بەدەستەوە بدات و مرۆڤی ئێرانی لەگەڵ چارەڕەشی، کورتبینی، خزمەت و ناپاکییەکانی پێشینیان لە ناوچەیەکی وا بەربڵاودا لە خەڵکناسی و کۆمەڵناسی و دەسەڵاتناسی ئاشنا بکات، سەبارەت بە نووسەر بەکورتی دەکرێ بگوترێ کە ئەو ئەم شتانەی بەهەر مەبەستێک نووسیویەتی، قسەکانی ئاوێنەنومای پێشینیانی ئەم ئاو و خاکەیە و هەندێک لە ڕەفتار و کرداریان بە ڕوونی دەردەخات.

سپاهان ٢٥ی تیر ١٣٨٤ی هەتاوی ئەبولقاسم سری

# کارنامەی ئەو گەریدانەی لە سەدەکاندا هاتوونەتە ئێران

گەڕیدەیەکی بێ ئەژمار بەدرێژایی مێژوو سەریان لە ئێرانداوە و نزیکەی هەزار سەفەرنامە و بیرەوەری سەفەر بە زمانی جیاجیایان لەپاش خۆیان بەجێهێشتوە کە لەوانە نزیکەی ١٣٥ دانەیان کراونەتە فارسی.

دەستەیەک لەئەم گەریدانە لە وڵاتانی ئیسلامییەوە هاتوون و هەندێکیتریان لە شوێنەکانیدیکەی ئەم جیهانە بەتایبەت ئەورووپاوە هاتوون، بەشی ئەورووپا پترە لە شوێنەکانی دی.

یەکەمین گەڕیدە ئیسکوولاکس (skylox) لە ٥١٦ی پێش زاینە و وا وێدەچێ یەکەمین گەڕیدە پاش ئیسلام بونیامین کوڕی جناح بێت، کە سەفەرەکەی لە ساڵی ١١٦٤ تا ١١٧٣ی زاینی (٥٤٩ تا ٥٨٦)ی کۆچیی درێژەی کێشاوە.

ئامانجی گەڕیدەکانی پاش ئیسلام بە ڕیزبەندی مێژوویی ئەمانە بووە:

هاندانی مەغولەکان، ئێرانییەکان و کەسانی دی بە قبووڵکردنی ئاینی مەسیح.

بەرگری لە هێرشی مەغولەکان بە ئەورووپا.

هاوپێوەندیی لەگەڵ ئێران دژ بە عوسمانی.

دامەزراندنی پێوەندیی بازرگانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا.

بەستنی پەیمانی سەربازی و سیایی (ئەو کاتانەی کە نوێنەرانی سیاسی دەهاتن).

دەرخستنە جوگرافیایەکان.

بەدەستهێنانی زانیاری بۆ ئامانجی سیاسی.

بەڵام گرنگ ئەوەیە کە لە سەردەمی قاجارییەکاندا پێشبڕکێی فەرانسا و ئینگلیز و ڕووس و ئینگلیز بە ئەوپەڕی خۆی گەیشت و مانۆڕ و خۆنواندنەکان لە بواری سیاسیدا بەرێوەبراوە و ململانێ و ئاڵۆزی و گرژییەکی بێ ئەژمار دروستکردووە و هەموو ئەم ئیستیعمارگەرانە ڕوویان کردووەتە بەدەستهێنانی زانیاریی سەبارەت بە ئێران.

پیشاندەری ئەم ڕەوتەی زیادبوونی گەڕیدە لە ئێراندا لە ١٦٠ی زاینی تا کۆتایی سەردەمی قاجار، چاپ و بڵاوکردنەوەی سەفەرنامەکانە لەئەورووپادا کە لە ئاماری ژێرەوەدا هاتووە:

## سەردەمی سەفەوییەکان ژمارەی سەفەرنامەی بڵاوکراوە کۆی گشتی

| | |
|---|---|
| ١٦٠٠ — ١٦١٠ | ٤ |
| ١٦١١ — ١٦٢٠ | ١ |
| ١٦٢١ — ١٦٣٠ | ٤ |
| ١٦٣١ — ١٦٤٠ | ٤ |
| ١٦٤١ — ١٦٥٠ | ٥ |
| ١٦٥١ — ١٦٦٠ | ١٢ |
| ١٦٦١ — ١٦٧٠ | ٨ |
| ١٦٧١ — ١٦٨٠ | ١٠ |
| ١٦٨١ — ١٦٩٠ | ١٠ |
| ١٦٩١ — ١٧٠٠ | ٨ |
| ١٧٠١ — ١٧١٠ | ٥ |
| ١٧١١ — ١٧٢٠ | ٧ |
| | ٨١ |

سەردەمی ئەفغانەکان

| | |
|---|---|
| ١٧٢١ — ١٧٣٠ | ٥ |
| ١٧٣١ — ١٧٤٠ | ٦ |
| | ١١ |

سەردەمی ئەفشارەکان

| | |
|---|---|
| ١٧٤١ — ١٧٥٠ | ٦ |
| | ٦ |

سەردەمی زەندییەکان

| | |
|---|---|
| ١٧٥١ — ١٧٦٠ | ٦ |
| ١٧٦١ — ١٧٧٠ | ٢* |
| ١٧٧١ — ١٧٨٠ | ٦ ** |
| ١٧٨١ — ١٧٩٠ | ٣ *** |
| | ١٧ |

سەردەمی قاجارییەکان

| | |
|---|---|
| ١٧٩١ — ١٨٠٠ | ٥ **** |
| ١٨٠١ — ١٨١٠ | ٦ |
| ١٨١١ — ١٨٢٠ | ١٤ |
| ١٨٢١ — ١٨٣٠ | - |
| ١٨٣١ — ١٨٤٠ | ٢٥ |
| ١٨٤١ — ١٨٥٠ | ٢٢ |
| ١٨٥١ — ١٨٦٠ | ٢١ |
| ١٨٦١ — ١٨٧٠ | ١٩ |
| ١٨٧١ — ١٨٨٠ | ٢١ |
| ١٨٨١ — ١٨٩٠ | ٢٠ |

| | |
|---|---|
| ١٨٩١ — ١٩٠٠ | ١٩ |
| ١٩٠١ — ١٩١٠ | ١٥ |
| ١٩١١ — ١٩٢٠ | ١٣ |
| | ٢٠٠ |
| سەردەمی پەهلەوی یەکەم | |
| ١٩٢١ — ١٩٣٠ | ٨ |
| ١٩٣١ — ١٩٤٠ | ٤ |

١٢*****

# پەراوێز

*لە کتێبی سەفەری ئەورووپییەکان بۆ ئێران نووسینی ژان شەیبانی (وەرگێڕانی سەید زیائەدین دەشیری، تاران: ناوەندی وەرگێران و بڵاوکردنەوەی کتێب لاپەرەی ٤٨٨، ئەم ژمارەیە بە یەک سەفەرنامە تۆمارکراوە.

**هەمان سەرچاوە، ئەم کارەیە بە چوار سەفەرنامە تۆمارکراوە.

*** هەمان سەرچاوە، ئەم کارەیە بە دوو سەفەرنامە تۆمارکراوە.

**** هەمان سەرچاوە، ئەم کارەیە بە سێ سەفەرنامە تۆمارکراوە.

ژمارەی سەفەرنامەکان و دووبارە چاپدانەوەیان لەهەمان کتێبی دوکتور شەیبانی وەرگرتووە. لە سەردەمی سەفەوییەکاندا هەندێک لە سەفەرنامەکان ٤٩ جار چاپ کراونەتەوە.

*****کتێبناسیی پەسینی سەفەرنامەکان، جەمشید سەداقەت کیش دەسنووس. لەسەردەمی قاجارییەکاندا ٢٦ سەفەرنامەی سەردەمی سەفەویەکان لەئەورووپا دووبارە لەچاپدرایەوە.

بەئەو پێیە دەبینین کە وەرگرتنی زانیاریی سەبارەت بە ئێران لە سەردەمی قاجارییەکاندا بۆ خۆرئاوا لە هەموو بوارەکاندا ئەوەندە گرینگ بووە، کە ٢٠٠ سەدەرنامەیان بڵاوبووەتەوە* بێگومان سەفەرنامە و ڕاپۆرتیش هەیە، کە هێشتا بڵاونەبووەتەوە.

سەیر لەئەوەدایە کە لە سەردەمی قاجارییەکاندا هەندێک لە فەرمانبەران و بەواتایەکی دی سیخوڕەکانی خۆرئاوا لە جلوبەرگی دیدا کاری خۆیان کردووە وەک: فریز، و.ئەمبری، دوکتور وێلز بەریز لە ڕۆڵی بازرگان، دەروێش و دوکتوردا بوون**

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی زاینی لە ساڵی ١٨٠٨دا (١٢٢٣ی هەتاویی) سر هارد جۆنز (hard jones sir) فەرمانبەری سیاسی لەگەڵ دەستەیەک لە کاربەرانی باڵوێزخانە دێنە ئێران. جیمس مۆریە لەگەڵیانە، ئەمانە لە ڕێگەی بووشەهر، شیراز، ئەسفەهان دێنە تاران. لە ساڵی ١٨١١ی زاینی مۆریە جاری دووەم لەگەڵ دەستەی سێر گوراوزلی (sir coeusely) لەهەمان ڕێگەی پێشووەوە دێتە ئێران، لەئەم سەفەرەیدا سکرتێری باڵوێزە. ( ئەم سەفیرە سکرتێرێکی دیکەشی بە ناوی دەبلیو. پراس هەبووە). کەوایە لەهەر دوو سەفەردا فەرمانبەری سیاسی دەوڵەتی بەریتانیا لەگەڵ باڵوێزدا بووە، لە ساڵی ١٨١٤ی زاینی مۆریە و هاوکارەکە دیکەی ئیچ ئەلیس، پەیماننامەی دۆستی نێوان بەریتانیا و ئێران دەبەستن. (ئەم پەیماننامەیە تا شەڕی ئێران و ڕووس لە ساڵی ١٨٢٨ی زاینی بەردەوام بوو، بەڵام لەوەبەدوا گۆڕانکاری لە ئێراندا کرا). بێگومان فەرمانبەرانی فەرەنسەش لەوانە ژنەراڵ گاردانی لە بەستنی پەیماننامەگەلێکی وادا دەستیان هەبووە.

پاش ئەوە مۆریە وەک زۆرێک لە لێکۆڵەران لە تەوریز مایەوە و سەرقاڵی کاری خۆی بوو. گرنگترین تایبەتمەندییەکانی دوو سەفەرەکەی مۆریە، بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکانەی خوارەوە بووە.

---

* لەئەم ژمارانە تاکو ئێستا ١٠٥ سەفەرنامە کراونەتە فارسی.

** گەریدەکان و ئێران – بەشی دووەم، لاپەرەی ٧٢.

١ ـ له سەفەری یەکەمیدا کاتی جەژنی لەدایکبوونی مەسیح بۆ دۆزینەوەی شاری بیشابور له کازرونەوە بەرێ دەکەوێ، پێش ئەو هیچ گەڕیدەیەکی دی سەبارەت بە بیشابور هیچی نەگوتوە. له ساڵی ١٦٧٢ی زاینیدا بۆ یەکەمجار ناوی ئەو شارە لەسەر نەخشە ئەورووپییەکان بەدەرکەوت. کەمپفر گەڕیدەی سەردەمی سەفەوییەکان لەئەوەی کە سەبارەت بە بیشابور بیستوویەتی، دەنووسێت بە بێ ئەوەی کە دیتبێتی. بەرواڵەت یەکەمین ئەورووپاییەک کە ئەم شارەی سەرلەنوێ دۆزیبێتەوە، سێر هارفۆرد جۆنزە. بەڵام ئەورووپا قەرزداری وردبینیەکانی مۆریەیە سەبارەت بە بیشابور و نیگاری بەرجەستەی تەنگەی چوگان.

٢ ـ مۆریە یەکەمین کەسە کە لە تەختی جەمشیددا دەستدەداتە هەڵکۆڵین، چەند هەیکەلێک لەژێر خاک دەردێنێت.

٣ ـ مۆریە نێزیک گوندی حاجیئاوا (لە شاری مەرودەشت و لە دوورترین شوێندا لە خۆرهەڵاتی کێوی نەقشی ڕۆستەم) ئەشکەوتێکی دۆزییەوە کە دیوارەکانی بە زمانی پەهلەوی نووسراوە.

٤ ـ مۆریە پاش سەردانی شاری پاسارگارد و لێکۆڵینەوە لە ئارامگە دایک سولەیمان (د.خ) و هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی ڕاپۆرتی مێژوونووسەکانی ڕۆمی و یۆنانی کۆن، لەگەڵ ئەم ئارامگەیەدا یەکەمینجار ڕایگەیاند کە ئارامگەی دایک سولەیمان هەمان ئارامگەی کورشە. لە سەردەمی سەفەوییەکانەوە تا سەردەمی مۆریە شاری فەسایان بە پاسارگاد دەزانی و پاش ڕاگەیاندنی مۆریە، نەوەد ساڵ تێپەڕی تا هەمووان قبووڵیان کرد کە ئەمە ئارامگەی کورشە.

٥ ـ نەخشی ڕەجەب لە دراوسێیەتی تەختی جەمشیددا یەکەمینجار مۆریە ناساندی و هاوکات لەگەڵ ئوزلیش وایکرد. بەڵام ماوەیەک پاش ئەوە فلاندن و کست بەدرۆ خۆیان بە دۆزەری نەخشی ڕەجەب ناوبرد.

٦ ـ مۆریە لە ساڵەکانی ١٨٠٩، ١٨١٢، ١٨١٣ چەندینجار سەری لە وێرانەکانی ڕەی دا و پاشماوەکانی قەڵایەکی لەگەڵ ئەستوونێک کە بەخەتی کوفی لەسەری نووسرابوو دۆزییەوە.

٧ ـ مۆریە لە شاری هەمەدان دا دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە لە وێرانەکانی هیگمەتانە، یەکەمجار کۆشکێکی گەورە و بینایەکی ئەستووندار کە وەک تەختی جەمشیدە دۆزییەوە، بیر و بۆچوونەکانی دانوپل و ڕەتل (دوو گەڕیدە) کە گوتبوویان هەمەدان هەمان هیگمەتانەیە پشتڕاست کردەوە.

لەرێگەی دۆزینەوەکانی مۆریە و لاتاردەوە پاش ئەوە خەڵکی ئەمریکا و ئەورووپا بەزۆریی ڕوویان لە شوێنەوارە کۆنەکانی ئێران کرد و گەڕیدەکانی دیکە ڕێگەی ئەوانیان گرت و دەگرنەبەر.!!

مۆریە سەرەڕای شوێنەوارە کۆنەکان، لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی خەڵکی ئێران، لەبیر و باوەڕە ئاینیەکان و ڕێوڕەسمەکانیان، وەک باوەڕی ئوقلیدییەکان بە کانیی ڕەسولئەڵا، باوەڕی شیرازییەکان بە نەخۆش کەوتنی منداڵان، ناونانی منداڵان، چۆنیەتی گۆڕ و کەرەستەی بیناکردنیان، شاترەکان، کونی حەڵاڵ و حەرامی دەشتی ئەرژەن*. پێشوازیی کازرونیەکان لە مەزنەکانیان، باوەری خەڵکی کازرون سەبارەت بە ڕێگە شاراوەکانی بیشاپور، باوەڕی ئێرانییەکان بە جادوو و کات لە دوو سەفەرنامەکەی خۆیدا بەوردی دواوە، کە لە کتێبەکانیشدا هاتووە.

---

* سەبارەت بە ئەم کونە کە هێشتا خەڵکی دەشتی ئەرژەن باوەریان پێیەتی، لە هیچ کتێبێکی فارسی و زبانەکانیدیدا جگە لە کتێبی مووریە شتێک نەوتراوە، لە سەرووی کانیی سەلمانی دەشتی ئەرژەن کونێکی تەسک لە کێوەکەدا هەیە، کە خەڵکیی دەڵێن: هەر کەس بتوانێ لەئەو کونە تێپەڕبێت حەڵالزادەیە ئەگینا بیژووە!

# پێش وتار

پاش هاتن بۆ ئینگلیز چونکە تێگەیشتم کە هەستی پەیجۆری سەبارەت بە هەرشتێك کە پێوەندیی بە ئێرانەوە هەبێ، لەئارادایە دەستم دایە چاپی ئەو یاداشتانەی کە پێشتر لەو وڵاتەدا نووسیبووم.

بەتایبەت کە زانیم لەدیاریکردنی هەندێك لەئەو شتانەی کە لە لێکۆڵینەوەی گەڕیدەکانی دیدا لەبەرچاو نەگیراوە، سەرکەوتووبووم. ئەم شتانە بەتایبەت پەیکەرەکان و کەلاوەکانی شاپور بووە، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە ڕاپۆرتی من سەبارەت بە ئەمانە کورتە، هێشتاش هیوادارم کە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی کەسانێك کە بۆ لێکۆڵینەوە لەبابەتێکی تازە و سەیر و سەمەرە لە من بەتواناترن بە ڕادەی پێویست شتێکم گوتبێت.

هەرچەند لەوانەیە سەفەرنامەکەی من بەپێی پێویست نەبێت، هیوادارم تا ئەوکاتەی کە سەفەرنامەیەکی گشتگیرتر نەنووسراوە ئەم بەرهەمە بەشێوەی بازنەی پێوەندیی زانیارییەکانی پەیوەست بەئێران، زانیاریی تەواوی تێدا بێت، ئەم بەرهەمە تەنیا شانازی بەوەوە بکات کە لە هەموو جێگەیەکدا ئەوەی بینیومە خێرا نووسیومە، هەروەها هەوڵمداوە کە بارودۆخی شوێنەکە شرۆڤە بکەم. جگە لەچەند شوێنێکی دەگمەن و تایبەتدا کە تەنیا لەئەوەی بینیومە و بیستومە دواوم، ئالودەی هیچ شتێکی تایبەت نییە و کەڵکم لە نووسین و کتێبی کەسانی دی وەرنەگرتووە. هەرچەند لە نووسیندا وردبینیەکی زۆرم بەکارهێناوە دیسانیش ناڵێم کەمتەرخەمی و پشتگوێخستنی تێدا نییە.

ماوەی نەبوونی من لە ئینگلیستاندا کەمێك پتر لەدوو ساڵ لەخۆ دەگرێت، لە ۲۷ی ئۆکتۆبەری ۱۸۰۷ لەگەڵ "سێر هار فۆرد جۆنز" نوێنەری تایبەتی و وەزیری هەڵبژێردراوی بەڕێز پادشای ئینگلیز بۆ کۆشکی پادشایەتی ئێران، بەکەشتی پاشایەتی سەفاییر (یاقوتی شین) بەکەشتییەوانی کاپیتان جۆرج دەیویس، لە پۆرتسمۆتەوە بەڕێکەوتین. پاش تێپەڕبوون لە مادیرا و تەنگەی ئومێدینیك لە ۲٦ ی ئەپڕیلی ۱۸۰۸دا گەیشتینە بۆمبایی، بەهۆی هەندێك کاری سیاسی تا دوازدەیەمی سێپتەمبەر لە بۆمباییماینەوە. لە ۱۳ی ئۆکتۆبەر هاتینە بوشەهر و لە ۱۳ی دیسەمبەر بەرەو پایتەختی ئێران بەڕێکەوتین. لە چواردەیەمی فێبریوەری ۱۸۰۹ گروپی بەڕێز پادشای ئینگلیز گەیشتە تاران. لە ۱۲ی مارسدا ڕێککەوتنامەی نێوان سێر هارفۆرد جۆنز و نوێنەرانی بەدەسەڵاتی ئێران ئیمزاکرا، لە حەوتی مانگی مای لەگەڵ میرزا ئەبو ئەلحەسەن نوێنەری تایبەتی پاشای ئێران لە کۆشکی پاشایەتی لەندەن. تارانم بەجێ هێشت، لە ۷ی سێپتێمبەر لەگەڵ میرزا ئەبو ئەلحەسەن گەیشتینە ئەزمیر. کە سواری کەشتی پاشایەتی بە کەشتیەوانی کاپیتان ئێسکاف بووین، لە ماڵتادا کەشتی سێکسیسمان بە کەشتی پاشایەتی گۆڕی لەئاکامدا لە ۲٥ی نۆڤەمبەری ۱۸۰۹ گەیشتینە پلیمۆت.

لێرەدا ئەگەر ئاماژە بە ئەو قەرزەی هاوسەفەرەکەم میرزا ئەبولحەسەن نوێنەری تایبەتی پێشووی ئێران نەکەم لە شوکرانە بێژیدا کۆتاییم کردووە. کە لە بابەتگەلی پەیوەست بەئێران زانیارییەکی زۆری پێدام و لە فێربونی فارسیدا بە خووخدەیەکی خۆش و قسەکردن لە هەر بابەتێك یارمەتی زۆری دام. لەبەرئەوەی کە پیاوێکی ناسراو بوو، لەکاتی مانەوەی لە ئینگلستاندا تا ئێستە پتر لە هەر بیانییەکی دی ئاوڕیان لێدایێتەوە، وا دەزانم ئەگەر لەئەم کتێبەدا هەندێك لە ژیانی ئەو بنووسم لە سنووری پشوودرێژی خوێنەران پترم تێنەپەڕاندیێت، لانی کەم هەست دەکەم کە کورتەیەك لە ژیاننامەکەی بۆ ئەو کەسانەی کە وەك بێگانەیەك ئەو هەمووە دۆستایەتی و میوانداریيان پیشانداوە جێگەی ڕەزامەندی بێت، لەئەم سەفەرنامەیەدا تەنیا ئەو ڕووداوانە، کە لە کاتی جێهێشتنی بۆمبایی تا گەیشتن بە قوستەنتەنییە بەسەرماندا هاتووە تۆمارکردووە، هەمووان بەپێی پێویست ئاگاداری سەفەری دەریایی لە ئینگلیستانەوە بۆ هیندستان و لە قوستەنتەنییەوە بۆ ئینگلیستان هەن، دیارە پێویست بەنووسینی زیاتر لەئەو بارەوە ناکات، ئەو وێنانەی کە لەئەم کتێبەدا هاتووە لەئەو وێنانەیە کە لە شوێنی خۆیدا کێشاومە و بەشێوەیەکی سەرپێیی بووە، هەر بۆیە پتر بە ئامانجی ئەوەبووە، کە هەندێ بیروباوەڕی گشتیی

بخاتە ڕوو نەك شرۆڤەی وردەکارییەکان. بۆ کێشانی نەخشەی بووشەهر بە تاران دەبێ سوپاسی کاپیتان جینت سۆتەرلێندی دۆستم لە سوپای بۆمبایی بکەم و بۆ نەخشەی گشتیی ئەو وڵاتانەی کە ڕێگەم تێکەوتوون و پێیاندا تێپەڕبووم دەبێ سوپاسی سەرگورد ڕێنێل بکەم کە بە میهرەبانییەوە یارمەتی دام و هەرکات پێویستم بە یارمەتی هەبووایە دریغی نەدەکرد و ڕێنوێنی و مۆچیاری دەکردم، نەخشەی تاران بۆ ئاماسییە کاری خۆمە، کە بە دەستە بەتواناکانی ئەم سەرگوردە هەڵەچنی کراوە، لەبەرئەوەی سەفەری من لە ئاماسییەوە بۆ قوستەنتنییە زۆر بەخێرایی و شەوانە بوو نەك بەڕۆژ، هەربۆیە ئەم نەخشەیە تەنیا تا ئاماسییەی تێدایە. سەرەڕای ئەوەش چونکە خەڵکی عوسمانی پتر لە خەڵکی ئێران چاودێری موسافیرەکان و گەڕیدەکانن، هەستم کرد کە ناتوانم بەو شێوەیەی کە دەمەوێ یاداشتەکانی خۆم بەئاسوودەیی بنووسم، هەرچەندە جلی وەك ئێرانییەکانم لەبەرکردبوو ئەو ڕێگە و مەودایانەی کە لە سەفەرنامەکەدا ئاماژەی پێدراوە دەبێ بەشێوەیەکی حەسابکردە سەرپێیانە دابنرێت، کە لە هەندێ شوێندا بە بەکارهێنانی پانتایی جوگرافیایی و لە هەندێ شوێنی دیدا شوێنەکان خەملێندراوە و بەسەر یەکەوە بە بەکارهێنانی تایبەتمەندی گەلێك وردەکارییەکان و بەرزی و نزمی ڕێگەکان ڕاست بکرێتەوە.

کاتی مانەوە لە ئێراندا بەڕێزان جۆکس و بروس فەرمانبەرانی ئینگلیزی دەزگەی ئیدارەی بۆمبایی هەندێك زانیارییان پێدام کە سوپاسیان دەکەم و لە هەر جێگەیەك لەم کتێبەدا ئەو زانیاریانەم نووسیبێت ئاماژەم پێداوە.

دەبێ بەتایبەت سوپاسی میهرەبانییەکانی ڕابەرایەتییەکانی ئینگلیز بکەم کە بەڕێکخستن و هەڵەچنی یاداشتەکانم سەفەرنامەکەی بۆ چاپ ئامادەکرد.

دەمهەوێ دیسان بڵێم کە ئەم بەرگە کاتییە و چاوەڕوانی ئەوە ناکەم کە هاوئاستی نووسراوە بەنرخەکانی شاردن و لێبرون و هەنوای و نیبۆهێر یان ئۆلیور دابنێم دەبێ چاوەڕوان بین کە بە کردنەوەی دەرگای پێوەندییە بەربڵاوەکانی ئێمە لەگەڵ ئێراندا کە دوابەدوای دوایین سەرکەوتنە سیاسییەکانی ئێمە لەگەڵ ئێراندا کراوە سەرانسەری ئەم بەشە سەرنجراکێشەی جیهان بناسین و ئەو بابەتانەی کە شایانی لێکۆڵینەوەن لەمێژینەییەکان و شوێنەوارە کۆنە و بەرفراوانەکانی ئەم وڵاتە کە تاکو ئێستە بەنیوەچڵی بینراوە و ناسراوە تیشکێکی تازە بخرێتە سەر مێژووی کۆن، ئاینەکان و ڕێورەسمەکان، نەریت و زمانەکەیەوە.

## ٢

مێژووی ئێران لە مەرگی نادر شاوە تا بەدەسەڵاتگەیشتنی شای ئێستە، کە پەنجاو یەك ساڵە، کەمتر شتێك جگە لە ڕیزبەندی ناوی دیکتاتۆرەکان و داگیرکەرەکان بەدوای یەکداهاتنی پیاوکوژان و خائینان و دیمەنی نەداری و چارەڕەشی و نەهامەتی پیشان دەدات.

پاش کوژرانی نادر شا یەکێك لەسەر سەختترین ڕەبەرەکانی تەختی خاڵی پاشایەتی، محەمەد حەسەن خانی سەرۆکی تائیفەی قاجار بوو، کە کوڕی یەکێك لە پلە بەرزەکانی بارەگەی دوایین پادشای سەفەوی شا تەهماس بوو.

محەمەد حەسەن خان چەندین کوڕی هەبوو.. حوسێن قولی خان، کوڕی گەورەی ئەو کە بابی پاشای ئێستەی ئێران بوو و لە شەڕ لەگەڵ تورکمانەکاندا کوژرا، ئاغا محەمەد خان کوڕی دووەمی پێش لەئەم پاشایەی ئێستە، کە برازای ئەوە بەتاج و تەخت گەیشتن، پاشایەتی محەمەد حەسەن خان ئەوەندەی نەخایاند، ڕووبەرووی دژایەتی کردنی کەریم خان کە خەڵکی لوڕستان بوو بووەوە، کەریم خان بەبیانووی پشتیوانی لەمافی ئیسماعیل کە لە بنەماڵەی سەفەوی بوو، کە لەئەو کاتەدا منداڵ بوو، لە وڵاتدا دەسەڵاتێکی گەورەی بەدەست هێنا، بەشێوەیەك کە خۆی بووە جێنشینی ئیسماعیل، لەکاتێکدا کە هێشتا زێدەخوازی و بەرزەفڕی خۆی لەژێر ناوی پارێزەردا دەشاردەوە، تەواوی دەسەڵاتەکانی ڕاستەقینەی پاشای ئێرانی بەکاردەهێنا. مێژووی لەدایکبوونی کەریم خان دیار نییە، بەڵام شێوەی سەرەتای ساڵانی ژیانی ئەوی بۆ ئەو ڕۆژگارەی کە تێیدا دەژیا و ئەو چارەنووسەی کە ئاواتەخوازی بوو ئامادەکرد، لە ڕاستیدا بنەماڵەکەی لە تیرەیەکی نەناسراو و نزمی کوردستان بوو، کە لە زەندییەکان بوو. بنەماڵەکەشی بەئەم ناوە ناوزەد کرا، پیشەی دزی بوو، کە تاقە پیشەی هەموو هاووڵاتییانیشی بوو، پیشەیەك کە ئەگەر گشتگیرتر بێت ناشیرینی و خراپیەکەی لەنێو دەچێ. (ئەو بەبێ گومان و ئاشکرا دەیگوت: لەلاوێەتیدا کارم دزی بوو، ددانەکانی پێشەوەم بە لەقەی ئەو کەرەی کە دزی بووم شکا.

## سەفەرەكانی فۆستەر بەرگی دووەو لاپەڕە ٢٤١

ئەو لەو پیشەیەیدا لێهاتوویی و خۆڕاگری سەربازی بەدەستهێنا و ناوبانگی بەدارابوونی ورەیەكی بێ باك و بەدەست و بردییەكی زۆر لەبەكارهێنانی شیردا ـ خەسڵەتێك كە لەنێو خەڵكدا نرخی زۆری هەیە دەركرد ـ . ئاژاوە و پشێوییەكی زۆر لەئێراندا هەر جۆرە توانایی و غیرەتێكی دەخستە كار. ئارەزووەكانی كەریم خان بەسەركەوتنە نیوە ناتەواوەكانی كەسانی دی پەرەی گرت و بەناسینی تواناكانی خۆی پێی نایە گۆڕەپانی خەبات و لە كۆتاییدا بەسەر ڕكەبەرە سەرەكییەكەیدا محەمەد حەسەن خان سەركەوت. محەمەد حەسەن خان بەرەو مازندەران ڕایكرد، لەوێ كوژرا كەریم خان منداڵەكانی دوژمنە كوژراوەكەی ئەسیر و زیندانی كرد و دەستی دایە سەركوتكردنی ڕكەبەرە لاوازترەكانی كە هەر یەكە و بەنۆبەی خۆی خوازیاری بەدەستهێنانی تاج و تەخت بوون، لە كۆتاییدا بە هەوڵە مەزنەكان و شیاوەكانی پاشایەتی بۆ خۆی مسۆگەر كرد، لەساڵی ١٧٥٥ كە لە شیراز مایەوە، ئەم شارەی كردە پایتەختی خۆی. بەدروستكردنی ژمارەیەكی زۆری خانوو و تەلار و باڵەخانەی ڕازاوە ئەم شارەی جوان كرد. باری ئێستەی ئەم تەلار و باڵەخانانە سروشت و سەلیقەی ڕاست و دروست و چاكی ئەوە. لە ئێراندا بەیادی ئەو پرسە و تازیە دەگرن، چونكە سەردەمی ئەو كە ڕۆژگار خۆشگوزەرانی و پایەبەرزی و گەورەیی بوو، لەگەڵ سروشتی خەڵكیدا دەهاتەوە. لە سەردەمی ئەودا بەئاشكرا پشتگیری سۆزانییەكان دەكراو پیشەكەیان لە ڕیزی پیشەی فەرمیدا بوو، سەرۆك یان نوێنەری ئەوان هەموو ڕۆژێك بەهەمان ڕێز و شكۆ كە تایبەت بە خان و میرزاكان بوو لەبارەگەی شادا بوو.

لە سێزدەیەمی مارسی ساڵی ١٧٧٩دا کەریم خان بەمەرگی سروشتی کە لە مێژووی نوێی ئێراندا ڕووداوێکی نائاسایی بوو کۆچی دوایی کرد. بەپێی ئەو مێژووە جۆراوجۆرانەوە کە بۆ بەدەستگرتنی دەسەڵات پاش مەرگ و میری ڕکەبەرەکانی هێناویانەتەوە ماوەی دەسەڵاتی ئەویان بە ١٩ تا ٣٠ ساڵ نووسیوە، لە سەردەمی لەناوچوونی محەمەد حەسەن خان قۆناخێکی چاکتر دەستی پێکرد و ڕکەبەرە سەرکەوتووەکەی ئەو ١٩ ساڵ دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو.

پاش مەرگی کەریم خان، دیسان هەموو شتێك تێکچوو سەردەمی ڕاوەورووتی، خوێنڕشتن نوێ بووەوە گێڕانەوەی سەردەمی کوردی بێنەوبەردەی جێگرەوەکانی ئەوەندە پێویست نییە، هۆگریەکمان بەیادکردنەوەی ناوەکانیان نییە، کەوایە هەر ئەوە بەسە، کە بڵێین کوڕان و براکان و خزمەکانی چواردە ساڵ لەگەڵ یەك لە شەڕ و ئاژاوەدا بوون، تا لە کۆتاییدا بەخت و ئیقباڵی ئەم بنەماڵەیە بەهۆی تێکشکان و ئاخرین و گەورەترین داواکاری تاج و تەختی زەمبیەکان لوتف عەلی خان لەناوچوو ساڵی ١٧٩٤دا پادشایی بە ئاغا محەمەد خان، کە بناخە دانەری بنەماڵی پاشایەتی ئێستەی ئێرانە گەشت.

## چەند وتە و لێگێڕانەوەیەک سەبارەت بە جیمس مۆریە و بەسەرهاتەکانی

جیمس ژوستینین مۆریە نووسەری گەڕیدە، لێکۆڵەر و بانگەخوازکەری ئاینی مەسیح، لە دوو سەفەردا هاتوەتە ئێران و سێ سەفەرنامەی بەکەڵکی سەبارەت بە دیتنەکان و دەرئەنجامگیرییەکانی لەئەم وڵاتە ئەوەندە دروست نووسیوە، کە ملهوڕێکی وەک فەتح عەلی شای قاجار کە هۆگرییەکی بە بیستنی قسەی ڕاست نەبووە، دووچاری بێتاقەتی و تووڕەبوونێکی سەخت کردووە.

بەسەرهاتی یەکەمین سەفەری بە ئێران لەگەڵ سێر هارد فۆرد جۆنز ئیلچی ئینگلیز لە یەکەمین سەفەرنامەکەیدا هاتووە، کە لە پێشووتارێکدا، کەم تا کورتێک لە ژیاننامەی نووسەر نووسراوە، لێرەدا هەر ئەوەندە بەسەکە بەپێی وتەی شارەزایان بڵێین، کە پێگەی ڕووداوە مەزنەکانی ژیانی مۆریە خۆرهەڵات بووە و بابی لە قوستەنتەنییە وەک کۆنسول ژیاوە، لە دەوروبەری ساڵی ١٧٨٠ لە ئەزمیر لەدایک بووە. ڕووکردنی مۆریە بە پیشەی سیاسەت، میراتێکیناموبارەک بووە، کە لە بابییەوە پێی گەیشتووە، لەئەو سەردەمەدا — سەرەتای سەدەی نۆزدەی زاینی — کاربەدەستانی ئەورووپیی چاوی تەماح و زێدەخوازییە بێ سنوورەکانی خۆیان بڕی بوە خۆرگەڵات و لەوانە ئێران. ناپیلۆن ئیمپراتۆری فەرەنسا ویستوویەتی بە هاریکاریی پادشای ئێران سوپاکەی بباتە هیندستان. لەلایەکی دیکەوە چونکە بەڕێوەبەران و کاربەدەستانی ئیسعماری ڕووسیش لە سنووری باکووری ئێران و خۆرئاوای دەریای قەزوین لە بیری چەپەڵی دەستدرێژی بۆ سەر خاکی ئێراندا بوون، بەردەوام لە هەوڵی گرتن و فێڵ و پیلاندانان بوون، ئیستیعمارگەرە نامووبارەکەکانی ئەم دوو وڵاتە دەست لەنێو دەست کاریان بۆ ڕێکخستنی دەستڕاگەیشتن بە هیندستان کردووە و. ...

مۆریە جارێکی دی لەساڵی ١٨١١دا وەک سکرتێری نوێی ئیلچی ئینگلیز سێر گور ئوزلی هاتووەتە ئێران، ئیشی ئەم گرووپە سیاسەت پیشە ئینگلیزیە، بەستنی پەیمانێکی نوێ لەگەڵ: دەسەڵاتدارانی ئێران بووە، لە پێناو پووچەڵکردنەوەی هاوپێوەندیی فەرانسە — ڕووسدا بووە.

ئەو لە دوایین ساڵەکانی مانەوەی لە ئێراندا بووە بە بەرپرسی باڵوێزخانەی ئینگلیستان و لە ساڵی ١٨١٥ی زاینی خۆرهەڵاتی بەجێ هێشت و وەک کاربەدەستێکی پایەبەرز ساڵانی کۆتایی ژیانی خۆی لە مکزیکۆ ژیاوە. زۆربەی کاتی بە نووسین بردووەتە سەر و لە ساڵی ١٨٤٩ کۆچی دوایی کرد.

سێ کتێبی بەنرخی سەبارەت بە ئێران و خەڵکەکەی، کە لەژێر چەپۆکی دەسەڵاتدارانی دیکتاتۆر و نەزان گیانیان وەزاڵە هاتبوو نووسیوە، سەبارەت بەئەو دادوەریگەلێک لە ڕوانگەی جیاوازەوە بە شێوەی ئاسایی کراوە. هەندێک کە هاووڵاتییانی نووسیویانە* (سیاسەت پیشەیەکی بەرواڵەت سەرکەوتوو و بەختەوەر بووە، لە ڕووی بەهرە و توانایی گەڕیدەییەوە زۆر باش بووە کە لە شتە سەرنجڕاکێشەکانی وڵاتان و خەڵکانی بێگانە خۆشحاڵ بووە و لەژێر ڕووناکایی توانای هاودەردی نواندنی لە چوارچێوەی گاڵتە و گەپدا توانیویەتی چەن هۆیەک هەڵسەنگێنێت و کەسانێکی کە لەگەڵیدا هاوخوو و هاوسرووشت و هاوچەشن نەبوون هانداوە، وەک کارمەندێکی باڵوێزی ئینگلیز لەگەڵ کۆشکنشینانی ئێران کە بە دوای ئەوەدا بوون تا لەگەڵ ئەو کەسانەی سەردانیان دەکات خۆش ڕەفتاری بنوێنن و بە جوان و ڕێکوپێک و بە مەزن پیشاندانی جەژنەکان و ڕێوڕەسمە دەوڵەتییەکان، دڵیان بەدەست بهێنن، هەڵسوکەوتێکی شارەزایانەی هەبووە. بەڵام ئێران وڵاتی دژەکان و ناهاوتاییەکان، باخە سەرسەوزەکان، کوێستانە نەزۆکەکان، داواکاریی زۆر و بێدەرەتانیی شەرمهێنەرە، و مۆریە وەک گەڕیدەی وڵاتێکی زۆر دڕندە گەرا تا تەماشای چەند گۆشەیەکی ئاڵۆز بکات، کە ژیانی زۆر جیاواز و جۆراوجۆر و ناهاوتا خەڵکی ئێران بەیەکەوە دەبەستێتەوە: لێکۆلینەوەی لە خووخدەی سەرکردەکانی حکوومەت و هەروەها خووخدەی وشترەکان کردووە، لە ڕوانگەی ژیانی ئێرانییەوە پەی بەرێز و پێگەی ڕێژەیی هەر یەکەیانی بردووە.

دوو سەفەرنامەکەی یاداش گەلێکن کە گەڕانەکان و ئەوشتانەی لە ئێران، ئەرمەنستان، ئاسیای بچووک و سێیەمینیشیان، حاجی بابا، تێکەڵەیەک لە ڕۆمان و سەفەرنامەیە.

چونکە داستانەکان و ڕواڵەتەکان ڕێک لەبەرهەڵگرتنەوەیەکە لە ئەزموونەکانی، هەروەک لە دوو سەفەرنامەکەیدا هاتووە. ویستوویەتی ڕاستییەکان لە سیمایەکی دراماتیکدا پیشان بدات، تا بتوانێ کاریگەرییەکی ڕوونی بەسەر ئەو خوێنەرانەدا هەبێت، کە ئاگادارییەکیان لە ئاینەکان و تایبەتمەنییەکانی وڵاتێکی مسوڵمانی وەک ئێران نییە، شێوەی کایە دەێرەکانی حاجی بابا لە ژیانی ئێرانیی، تایبەتکارانی خۆرهەڵاتناس باش پەسنیانداوە، زۆرجار بەدڵنیاییی و ڕێزەوە ئەوە: بە (کتێبێک سەبارەت بە ئێران) ناو دەبەن، نەک تەنیا بە بیستنی گاڵتە بزۆزەکانی قارەمانەکەی پێبکەنن.

........

مۆریە یەکێک لە گەڕیدە هۆشمەند و هەڵکەوتووەکانە کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم لە وڵاتانی خۆرهەڵات لێکۆڵینەوەی بەنرخی کردووە، لە دوو سەفەرنامەکەیدا وێنەی دڵرفێن و هەندێکجار ڕەندی زۆرە. هونەری مۆریە ئەوەیە کە ڕازاندنەوە و درێژکردنەوەی قسەکانی، خوێنەر بەدوای خۆیدا دەبات و سەرنجیان بۆ لای قسەکانی خۆی ڕادەکێشێ.

سەبارەت بە مۆریە خراپ نییە کە بیر و بۆچوونی خوالێخۆشبوو مەسعودی ڕەجەبنیا بهێنینەوە، کە لە جێگەیەکدا نوسیویە: ( گومانی تێدا نییە کە نووسەری کتێب مرۆڤێکی دەمارگرژ بووە لە ئایەنکەی خۆیدا، سەبارەت بە خەڵکی ئێران و ئاینی ئیسلامیش قین لەدڵ و ڕەشبین بووە، هەندێکجاریش بێ ئاگا بووە و ئەم بابەتانە چەندینجار لەئەم کتێبەدا دەرکەوتووە).

با هەندێکیش لە ڕخنەگرە لێکۆڵەرە ئێرانییەکان ببیستین، خوالێخۆشبوو مینەوی سەبارەت بە کتێبی حاجی بابای مۆریە دەنووسێ: (پاش وەرگێڕانەکانی چوارینەکانی خەیام، لەوانەیە هیچ کتێبێکی ئینگلیزی بەڕادەی بەسەرهاتی حاجی بابای ئەسفەهانی، ئێران و ئێرانیی نەخستووەتە سەر زمانی ئەوروپییەکان.

خوالێخۆشبوو عەباس ئیقباڵ ئاشتیانیش سەبارەت بە کتێبی حاجی بابای مۆریە لە ڕوانگەی نیشتمان پەروەری و ئێران دۆستی خۆی، داوەری کردووە و نووسیویە جیمس مۆریە بە نووسینی ئەم کتێبە بە خەیاڵی خۆی ویستوویە کە داب و نەریت و ئاکار و شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و بیروڕای نەتەوەیی و دەڕبرینە زمانییەکان و خوڵقە باو و ئاساییەکانی خەڵکی ئێران بە خوێنەرە ئینگلیزی زمانەکان تێبگەیەنێت،

بەڵام هەقبێژیی ئەمەیە کە نووسەری کتێبی حاجی بابا بەهەمان ڕادە کە توانایی لە نووسینی کتێبەکەیدا بەکاربردووە بە هەمان پلەش لە نووسینی ئەو واتایانەی کە ویستوویەتی پیشانی بدات، هەقبێژ نەبووە و کینە و ڕک و دڵپیسی و بەدخوایی پیشانداوە، واتە لە هەموو شوێنێکدا، گەمە و تیتاڵی پێکردن و تانە و خنەی ئازادە و گەوەکردنی کەموکووڕی و ناشیرین پیشاندانی ئەو داب و نەریتانەی کە ئەو بە خراپی زانیون بەسەر سروشتیدا زاڵە، بەشێوەیەک کە ئەگەر کەسێک گەلی ئێرانی نەناسێت و ئاگاداری ڕابردوو و ئێستەی ئەو نەبێت، بەخوێندنەوەی کتێبی حاجی بابای مۆریە ئەو گەلە تەنیا بە دواکەوتوو، خوێری و هیچ و درۆزن و دەڵەچە و ڕیاباز و زاڵم و لە هەموو ڕوویەکەوە، دوور لە ڕێوڕەسمی مرۆڤایەتی و ئاینی شارستانیەت دەناسێت و هیچ زانایی و داناییەکیان تێدا بەدی ناکات).

## پێش وتاری جیمس مۆریە بۆ بەرگی دووەم

ئەم کتێبە وێکهاتەی ڕاپۆرتی ڕۆژانەی نزیک شەش ساڵی سەفەرە. بنەچەی بابەتەکان سەبارەت بە زانستەکان، هونەرەکان، تەنانەت داودەزگە سیاسییەکانی ئەو وڵاتانەی سەفەرم بۆ کردوون، نییە، (هەر کام لەئەم بابەتانە پێویستی بە کتێبێکی سەربەخۆ دەبێت). بگرە پتر سەبارەت بە تێروانینی ڕێوڕەسمەکانی ئێرانییەکان و شرۆڤە و بەراودگەلێکە کە کاتی دیتنی ئەوانە لە شوێنی خۆیدا بەدەستهاتوون، بەڵام شرۆڤە و ڕوونکردنەوەی هەر تێڕوانینێک کە لە کتێبی یەکەمدا هاتووە لە سەفەرنامەی دووەمدا کورتە، هەرچەندە لە دەستنووسەکەدا پتر بێت، دیسانیش لە ئەو جێگەیانەدا گفتوگۆکانی باڵوێزخانە مەزن لە گفتوگۆگەلێک دەچوو کە لە مەئمورییەتی پێشوودا سەریگرتووە و لە سەفەرنامەی پێشوودا نووسراوە، کورت کراوەتەوە، بەئەو ڕادەیەی کە بۆ پێوەندی ئەو بەشانەی کە بوێ دەنوێنی و پێویست بێت.

لەلایەکی دیکەوە لە هەریک لەنێو ئاینە باوەکانی خۆرهەڵات و ڕوونکردنەوەی نووسەرانی کتێبی پیرۆز و کەسانی دیدا هاوسەنگییەکم دیتوە، کە توانیویە مێژووی کۆن ڕوون بکاتەوە و شێواز یان گێرانەوەکانی کتێبی پیرۆز ڕوونتر پیشان بدات، ڕاپۆرتی ڕۆژانەی بێ گەڵاڵەکردن و گۆڕانکاریم هێناوەتەوە و گێرانەوەکانم بە شرۆڤە و ئاوالەکردنێکی پترەوە گوتووە.

ئەو بەشانەی لە سەفەرنامەکە، بە وردییەکی پترەوە پارێزراوە، ئەو یادداشتانەیە سەبارەت بە ئەم بابەتانە بێت؛ چونکە ئاینەکانی خۆرهەڵاتیەکان سەرەڕای گۆڕانی حکوومەت و نەریت و ڕێباز هێشتاش هەمانە کە بووە. هەموو ئەم ئاینانە نیشانەگەلێکن کە لە چوارچێوەیەکدا داڕێژراون، لەهەر هەنگاوێکدا شتێک، زاراوە یان جلوبەرگێک یان ڕێوڕەسمێک لە ژیانی گشتی، ڕۆژگاری کۆن دێنێتەوە یادی

گەڕیدە. بەتایبەت جوانی و وردیی و ڕاستیی ناوەرۆک و مێژووی کتێبی پیرۆز دەسەلمێنێ. لەوانەیە لە سەرانسەری خۆرهەڵاتدا جێگەیەک نەبێت کە لەئەم بیر و بۆچوونانە سەبارەت بە ئەوانە دروست نەبێت. چونکە هەر جۆرە جیاوازییەک کە لە ڕێرەوی ئاین و حکوومەت یان زمان کە لەوانەیە لەنێو خۆرهەڵاتییەکاندا بێت، هێشتا لە نێوان هیچ یەک لە دوو میللەتێک لەئەوانەدا جیاوازییەکی وەها نییە، وەک میللەتانی ئەورووپا – ئاسیا بەروونی لەیەکدی جیاناکرێنەوە.

دووری زۆر لە زێدی خۆم کە لەئەو ماوەدا گوێم لە زمانەکانی دیکە پتر لە زمانی زگماکی بوو، لەوانەیە ئەوە تاڕادەیەک نەبووبێتە هۆی داوای لێبووردنکردن لە بەکارهێنانی هەندێک لە چەمک و دەستەواژە بێگانەکان کە ژمارەیان لەئەم کتێبەدا گەلێک پتر لەئەمانە دەبوو.

جەنابی ڕۆبرت ئینگلێس دوایین کتێبمی هەڵەچنی کرد و لە بڵاوکردنەوەی ئەم بەرگەشدا جوامێری نواند و منی پتر قەرزارباری خۆی کرد. سوپاسی یارمەتییەکان و ڕێنوێنییەکانی جەنابی دوکتور ئیرلەند بەرپرسی وۆست مینیستر دەکەم. هەروەها دەندانی ئەمەکگۆرینەوەکانی سیر گۆ ئوزلی ئیلچی و وەزریی هەڵبژادەنی پێشینی ئەعلاحەزرەت لە ئێران و بەگشتیی دۆستانم لەئەو وڵاتەدا، بەتایبەت سەروان مانێت لە ئندازیارییەکانی مامۆستا و جەنابی برۆس نوێنەری کۆمپانیای هیندی خۆهاڵات لە بووشەر دام.

سەبارەت بە ئەو یداشتانەی پێوەندییان بە بابەتگەلی دەریاوانی هەیە دەینداری خوالێخۆشبوو گاترۆپ، گەمیەوانی کەشتی لاین و گەمیەوانی پاش ئەو (ئەل سێت)م. لەکاری سەبارەت بە جۆگرافیا کە زانیاریی تەواوم نەبوو، دەبێ ئەمەکناسی پێشنیار و جوامێریەکانی سەرگورد ڕەنێل بم.

سەبارەت بەئەو نەخشی سەر مس و دارانەی کە لەئەم کتێبەدا هاتووە دەبێ بڵێم چ ئەو کاتەی کە لە سەیرانگەکاندا سەرقاڵی کێشانەوەیان بووم و چ ئەو کاتانەی کە ڕێبەرایەتی هونەرمەندانی ئەم وڵاتەم لە پلاندانانی بابەتە جۆراوجۆرەکانم، لەئەستۆ بوو، ئامانجم ئەمەبوو کە ئەوەی کە پتر لە هەمووان لەڕاستییەوە نزیکە بخرێتەروو، ئەو نەخشانەی کە لە وڵاتی خۆمدا بەکەڵک وەرگرتنێکی زۆر لە توانایی نەخشەکێشەکانی جەنابی سیدنی هاڵ ئامادەم

کردووە، لەوانەیە بابەتگەلێکی نوێ بۆ پەرەپێدانی زانیاریی ئێمە لە جۆگرافیای باکوری ئێران بێت.

شێوەی دەربرین و نووسینی ڕاستیی وشە خۆرهەڵاتییەکان بە شێوەی ئەورووپایی، بەشێوەیەکی بابەتیانە دەبێ گەڕیدە ئەووپاییەکان سەبارەت بە ئەوە داوای لێبووردن بکەن، دەمێنێتەوە؛ چونکە بۆ کەسانێک کە لە مێژووە جیاجیاکانن، توانی قەبووڵکردنی پێوەرێک نییە، تەنیا دەڵێم کە لەسەرانسەری ئەم کتێبەدا هەوڵمداوە لە شێوەی نووسینی چەمک و زاراوە خۆرهەڵاتیەکاندا شێوەیەک هاوتایی و یەکجۆری هەبێت، تەنیا لە کاتی پێویستدا نەبێت لە شێوەی نووسینی کتێبە پێشوەکەمدا و شێوەی گەڕیدەکانی پێشووتری وڵاتەکەم نەچم.

## بەرگی دووەم لاپەڕەی ١٩٣

لەرۆژی ١٨ی سێپتێمبەری ساڵی ١٨١١ – ٢٩ی شەعبانی ١٢٢٦ یەکەمین جار ئەستێرەیەکی کلکدارمان لەباکوری خۆرئاوای ئەسفەهان دیت. ئێرانییەکان بەئێمەیان گوت پێشتر لە ئاراستەی دوو ئەستێرەی حەوتەوانانی گەورە ئەم ئەستێرەیان بینیوە. ئەوان ئەستێرەی کلکداریان بە نیشانەی (مورغوا) وە بەخاڵی خراپیان لێك دەدایەوە نیشانەی هەڵگیرسانی شەڕ و ئاوارەیی و وشکەساڵی و بەڵا و ئەو شتانە دەزانی. شاعیری بەساڵاچوو محەمەد قاسم والە، بۆناپارتی بە ئەستێرەی کلکدار شوبهاندووە و گوتوویە کە ئەو پێی بنێتە هەر وڵاتێك بەدبەختی و بەڵا بەدوای خۆیدا دێنێت.

کاتی مانەوەمان لە ئەسفەهان شەڕی نێوان محەمەد عەلی میرزا حاکمی کرماشان و عەبدولرەحمان پاشا حاکمی بەتوانای کوردستان ترسێکی مەزنی پێکهێنابوو. هۆی سەرهەڵدان و پەرەسەندنەکەی ئەمەبوو..

حکوومەتی کوردستان لەژێر دەستی سەرکردەکانی ئەوێدایە، کە هەندێکیان سەر بە دەوڵەتی عوسمانی و هەندێکیشیان سەر بەحکوومەتی ئێرانن، ئەوانی دیش سەربەخۆییەکی ڕواڵەتییان هەیەو بەپێی شیاو و لەباربوونی قازانجیان لە چوارچێوەی یەکێك لەئەم دوو وڵاتە دەچنە وڵاتەکەی دی، ژیانی کۆچەرییان لەرێگەی دزیەوە دابین دەکرێ. عەبدولرەحمان پاشا سەر بە حکوومەتی عوسمانی و نزیکی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی (پاشالیق)ی بەغدا بوو. بەهۆی سەرپێچییەکانییەوە پاشای بەغدا ئەوی لە پلە و پایەی خۆی لابرد، ئەویش بۆ ئێران هەڵات و داوای یارمەتی کرد. ئێرانییەکان نێوبژیوانی نێوانیانی کرد و هەردوولا ئاشتبوونەوەو ئەو گەڕایەوە ناوچەی دەسەڵاتی خۆی، بەو مەرجەی کە کوڕەکەی لای پاشای ئێران بەبارمتە بهێڵێتەوە تا ناچار بێت

باجێکی ساڵانە بداتە ئێران، پاش ماوەیەك باب عالی لە شێوەی هەڵسوکەوتی سلەیمان پاشای بەغدا نارەحەت دەبێت و لە فەرمانێکدادەسەڵات دەداتە ڕەئیس ئەفەندی کە بچێتە بەغدا ئەو لابدات و عەبدوڵا ئاغا لە جێگەی دابنێت. (عەبدوڵا ئاغا تورکێکی ئابڕومەند بوو، کە لە بووشەهردا سەردەمی خانەنشینی دەژیا). ڕەئیس ئەفەندی لە بەغدا تێدەگات کە توانایی بەرەنگاربوونەوەی پاشای نییە، کە خۆی بۆ شەڕێکی تۆکمە ئامادە کردووە، هەر بۆیە داوای یارمەتی لە عەبدولرەحمانی کورد دەکات. عەبدولرەحمان پاشا کە جارێکی دی هێزی کۆکردبۆوە سوپایەکی زۆری بۆ یارمەتی دانی ئەفەندی دەنێرێ و لە شەڕ لەگەڵ دوژمنی کۆنینەی بەغدای خۆی ئەو شکست دەدات و دەیکوژێ. پاش ئەوە ڕەئیس ئەفەندی دەیەوێ قۆناخی دووەمی ئەمرەکەی باب عالی جێبەجێ بکات و عەبدولرەحمان کە سەرمەستی سەرکەوتنی بوو، داوا لە ڕەئیس ئەفەندی دەکات، کە لەبەرانبەر خزمەتەکانیدا یەکێك لە دۆستەکانی خۆی کە بەرێکەوت ئەویش ناوی عەبدوڵا بوو بەجێگەی عەبدوڵا ئاغا بکاتە پاشای بەغدا.

عەبدولرەحمان پاشا لە کارە سەرکەوتووەکانی لەخۆبایی ببوو، پەیمانی خۆی لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا شکاند و داوای کوڕە بەبارمتە گیراوەکەی کرد. لەو کاتەدا کوڕەکەی ئەو کات لەکۆشکی پاشایەتی لای محەمەد عەلی میرزا ڕەوانەی کرماشان کردبوو، دەسەڵاتدارێتی محەمەد عەلی میرزا لەگەڵ کوردەکاندا هاوسنوور بوو. پاشا هێزەکانی خۆی کە لەو لەشکرکێشیانەی دواییدا بەهێز ببوو کۆکردەوە و هەڕەشەی لە محەمەد عەلی میرزا کرد، کە ئەگەر بەبێ دواکەوتن کوڕەکەی نەنێرێتەوە، تەنانەت هێرش دەکاتە سەر کرماشان. شازادەی قاجاریش دەستی دایە کۆکردنەوەی سوپا و هەوڵ و ئیرادەیەك کە لە تایبەتمەندییە بەناوبانگەکانی ئەوە بێ دواکەوتن هێرشی کردە سەر ناوچەی ژێر دەسەڵاتدارێتی پاشا و بەشێوەی باوی وڵاتەکەی هەرچی لەسەر ڕێگەیدا دەستی کەوت سوتاند و تاڵان و وێرانی کرد. سەبارەت بە ویست و ئیرادەی قایم و بوێری محەمەد عەلی میرزا دەڵێن کفنەکەی لەگەڵ خۆی دەگێڕا. ئەم کارە لای ئێرانییەکان واتە دەبێ بەمردن یان سەرکەوتن شەڕ تەواو بکرێ. ئەگەر ئەو وتەیەی ئێرانییەکان قبووڵ بکەین بەزیپك و زاکۆنی ئەو کوردەکانی تووشی هەراسانی و شڵەژانی کرد، عەبدولرەحمان پاشا بەجێگەی ئەوەی چاوەڕوانی هێرشی شازادە بێت پەنای بۆ کێوەکان برد و سلێمانی بۆ

هێرش و پەلاماری ئێرانییەکان بەجێهێشت. شازادە بەخێرایی ئەم شارەی گرت. ئەو ڕۆژەی لە ئەسفەهان خۆمان کۆکردەوە و باروبنەی سەفەرمان بەست و وەدەرکەوتین، بیستمان کە شەڕ و پێکدادان بەم شێوەیە تەواو بوو، کە عەبدولرەحمان پاشا خێزانەکەی و یەکێك لە کوڕەکانی خۆی لەگەڵ پەنجا هەزار تمەن پێشکێشی بنێرێتە لای ئێرانییەکان بەو مەرجەی کە دووبارە حکوومەتی سلێمانی پێ بدەنەوە. هەروەها بڕیاردرا کە ساڵانە بەهەمان ڕادە ماڵیات بەحکوومەتی ئێران بدات. نموونەیەك لە دڕندەیی محەمەد عەلی میرزا نابێ لەبیر بکرێت. چەند ڕۆژ پاش بەڕێکەوتن لە کرماشانەوە بۆ هێرشکردنە سەر عەبدولرەحمان پاشا لەئەوپەڕی تووڕەییدا ئەمری کرد، کە کوڕی پاشا (بارمتە گیراوەکە) بکوژن. و ئەم ئەمرە ستەمگەرانەیە بەبێ ئەملاو ئەولا جێبەجێ کرا.

## لاپەڕەی ٣٥٧ فەسڵی بیست و یەکەم.

لە ڕۆژی گەیشتنمان بەناوچەی ژێر دەسەڵاتی سەرداپ (سەرداری ئێریوان) هەموو جمووجۆڵێکمان لەژێر چاودێری ئەودابوو. کاتی هاتنمان بۆ ئێریوان بۆ ڕێزگرتن و بەخێرهێنانی میوانەکان هەوڵی زۆریدا. ڕۆژی سێزدەیەم بۆ هەڵاتن لە داب و نەریتی پێشوازی (لەدەقەکەدا پێشوازی نووسراوە) بەرەبەیان بەڕێکەوتین. بەڵام بەخت یار نەبوو، چونکە هێشتا ڕۆژ نەبووبۆوە کە تاقمێکی زۆر لەسوارەی سەربازی لەگەڵ فەرماندە جۆراوجۆرەکانیان گەیشتن تا ڕێز لە ئیلچی بگرن. سەرەنجراکێشترین تاقم دەستەیەکی مەرزن لە کوردەکان بوو، کە لەباری جلوبەرگ و ڕواڵەتی تایبەتییەوە لەگەڵ ئێرانییەکاندا گەلێك جیاواز بوون، ئەمانە دیمەنێکی جوانیان خوڵقاند، کە خافڵاندنێکی گەلێك چاك بوو. کڵاوەکان و چەکەکان ساز و بەرگی ئەسپەکان و ڕواڵەتیان لە تورکەکان دەچێ. بەڵام لەسیمایاندا جۆرێك لە دڕندەیی تایبەتمەندیی ژیان و کۆچەری دەبیندرێ. سەردار زۆرێك لەئەم کوردانەی لەژێر ڕکێفدا بوو، سەرکردەکەیان حوسێن ئاغا پیاوێکی قورس و گران بوو، سواری ئەسپێکی سپی و جوان ببو جلوبەرگێکی ڕەنگ سووری پانوپۆڕ کە چینی زۆر جوانی هەبوو لەبەرکردبوو، ئەگەر هەڵسەنگاندنێك لەنێوان ئێرانی و کورددا چ بەشێوەی تاك و چ بەشێوەی کۆمەڵ بکرێت بەقازانجی کوردەکان تەواو دەبێت، ڕەنگی زیندووی جلوبەرگەکەیان کە لە پارچەی کەتان و ئاوریشم و مەخمەل بوو، لە جلوبەرگی ئاماڵ ڕەشی پەمەیی و کەوڵ پۆسی ئێرانییەکان گەلێك چاتر بوو، کوردەکان بەنمایشکردنی شێوەی شەڕکردنی خۆیان ئێمەیان خافڵاند. دەستەیەکی زۆر لەوانە بەسواری ئەسپ لەپێش ئێمەوە غاریان دەدا و نێزەکانی خۆیان

بادەدا و بەدەمانچە تەقەیان دەکردو بەدەنگی بڵند هاواریان دەکرد، بەجۆرێك کە باوەڕمان هێنا کە زۆر دڕندانە شەڕ دەکەن.

لە نزیك شار سەردارمان دیت کە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆردا بەرەو ڕووی ئێمە دێت، تا ۳۰۰ هەنگاوی ئەو خێوەتەی کە هەڵیاندابوو هاتە پێش، بڕیاربوو لە ۳۰۰ هەنگاوی ئەم خێوەتەدا ئیلچی ببینێت. ئەم دووانە بەڕێوڕەسمی زۆر بەرەو خێوەتەکە بەڕێکەوتن، لە خێوەتەکەدا وەك شێوەی باو دەستمان بەکێشان و قاوە خواردنەوە و شیرینی خواردن کرد، لەو ماوە کورتەدا کە لەخێوەتەکەدا بووین نموونەیەك لە وەحشیگەری ئەم پیاوە دڕندانەم دیت، ئەوان وەك دابونەریت سەرقاڵی هاویشتنی نەیزە و تەقەکردن بە دەمانچە لە یەکدی بوون، کە کتوپڕ لەنێوان کوردێك و ئێرانییەك هاتە هات و بگرە و بەردەیەك سەری هەڵدا، پاشان پێکدادانەکە گشتگیرتر بوو، لەو نێوەدا دوو پیاو کوژران، پێیان گوتین، کە لەئەم یارییانەدا کەمتر پێش دێت کە کوشتاری لێ بکەوێتەوە.

لە ئێریڤاندا ڕۆژێکمان لەگەڵ سەردار بەسەر برد. ئەو لە تەلارێکی گەورە و فراوانی کۆشکدا میوانداری لە ئیلچی کردبوو. زۆر قسەخۆش و لە هەموو بابەتێکدا زماندار بوو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ۱٤۰ میل درێژی و هەشتا میل پانی بوو. بەپێی بەراوردی حەسەن خان برای سەردار کە سەرژمێری گوندەکانی دەکرد، ژمارەی دانیشتووانی ئەو کاتی ئێریڤان ۱۸ هەزار و ۷۰۰ پیاو لەنێوان ۱٥ تا ٥۰ ساڵە بوە کە ئەگەر ژمارەی ژنان و منداڵان و پیرە پیاوەکانیش چوار ئەوەندە ئەژمار بکەین لەسەر یەك ۷٤ هەزار و ۸۰۰ کەس دەبێ. ئەم ژمارە هەموو تیرەکانی ئێڵ نشینەکەیە، جگە لە کوردەکان. کوردەکان چینێکی تایبەت لە خەڵکی ئێرەوان و بەجیا سەرژمێری دەکرێن، ئێستە پێنج هەزار بنەماڵەی کورد لە ناوچەی دەسەڵاتدارێتی حکوومەتی ئێریڤاندا دەژین، کە لەگەڵ ۷٤ هەزار و ۸۰۰ کەسەکەی دی کە ئاماژەم پێدا بەسەر یەکەوە سەد هەزار کەس لە دانیشتووانی ئێریڤان کوردن.

## لاپەڕەی ٣٦٩ بەشی بیست و دووەم.

(لە ئەبران) لەگەڵ حوسێن ئاغا سەرکردەی یەکێك لە تیرە گەورەکانی کورد ئاشنا بووم، چەندین جار کە لەگەڵ خزمەکانی سەردانی خێوەتەکەی ئێمەیان کرد لە ڕواڵەتیاندا سروشتی دڕندەیی و کاریکاتۆر وەها تێکەڵی یەك ببوون کە بڕیارمدا نیگارێك لە سێ کەسیان کە سیمایەکی سەرنج ڕاکێشیان هەبوو بکێشم، ئەو پیاوە نێزە بەدەستە خزمی سەردارە بەهۆی بەهێزییەوە ئۆکۆس یان گاجووتی پێ دەڵێن.

لاپەڕەی ٣٩٦

لە سی و یەکەمی ئوت ڕێوڕەسمی جەژن، یان جەژنی تایبەتی دەماوەند بەڕێوەچوو، ئەم جەژنە کە پێوەندی بە ئیسلامەوە نییە، شایانی سەرنجدانە، ڕێوڕەسمەکەی یادهێنەرەوەی مەرگی زوحاکی بەڕەگەز عەرەبی ستەمکاری بەناوبانگە و جەژنی شایی گشتییە، کە هەموو خەڵکی دەماوەند و گوندەکانی دەوروبەری بەشداری تێدا دەکەن و بەسواری ئەسپ و قاترو چوارپێکانی دی لە دەشتەکاندا کۆدەبنەوە و دەست دەکەن بەغارغارێن و هوتاف کێشان، شەو لە سەربانی خانووەکانیان ئاگر دەکەنەوە، سەرتاسەری کوچە و کۆڵانەکانی شار چراخان دەکەن و دەیڕازێننەوە.

هەقایەتەکە بەم شێوەیە کە دوو مار لەشانەکانی زوحاك سەریان هێنایە دەرێ کە دەبووایە هەموو ڕۆژێك بەمێشکی سەری مرۆڤ تێر بکرێت، هەموو ڕۆژێك بەرەبەیان دوو پیاوی دەماوەندیان بۆ ئەم کارە قێزەونە دەبردە قوربانیگە کە لە ئاکامدا لاوێك کە مکوڕ و ئامادەبوو بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەی لەچنگی ئەم عەرەبە ستەمگەرە بەهاوشارییەکانی خۆی گوت، ئەگەر ئەوم کوشت لەسەر لوتکەی کێوێکی نزیك ئاگرێك

دەکەمەوە کە نیشانەی مەرگی ئەو و سەرکەوتنی منە، لاوەکە لەکێوی دەماوەند یان شوێنی نیشتەجێبونی زوحاك نزیك بووە و ئەوی کوشت. چراخانی و ڕازاندنەوە و ئاگرکردنەوەی دەماوەندییەکان یادگاری ئەو ئاگرەیە کە لاوە سەرکەوتووەکە لەسەر کێو هەڵی کرد. لای جووتیارانی دەماوەند داستانی زوحاك بەم شێوەیە، بەڵام میرخواندی مێژوونووسی ئێرانی لە کتێبی ڕەوزەت ئەلسەفادا داستانەکەی بەرووداوی جۆراوجۆر و بەدرێژی باس کردووە بەو جۆرەی کە گرنگیەکی پتر بەم جەژنە دەدات. بەم جەژنە دەڵێن جەژنی کوردی، لەوانەیە لەو ڕووەوە بێت کە ئەوانەی کە بۆ ڕزگاری لەدەستی زوحاکی ستەمگەر بۆ کێوەکان هەڵاتن کەسانێك بوون کە پاشان تیرەی کورد لەئەوانەوە داکەوت.

## لاپەڕەی ٤٣٧ بەرگی دووەم

کاتی تێپەڕبوون لە دەشتی ئێریڤان ژمارەیەکی زۆری کوردی هەڵهاتووی ژێردەسەڵاتی عوسمانیمان دەدیت، کە بەرەو ئەو ئاواییانەی کە سەردار بۆ نیشتەجێبوونیان لەبەرچاوی گرتبوو دەرۆشتن. ڕۆژی گەیشتنم بە ئێریڤان سەردارم بینی، باسی ئەو ڕووداوانەی کرد، کە بووەتە هۆی کۆچی کوردەکان لە عوسمانییەوە. کاتێک بابا پاشا (سەر عەسکەر)ی ئێستەی ئەرزرووم تازە بە فەرمانرەوایی گەیشتبوو، شاری بایەزید و دەوروبەری لەژێر دەسەڵاتی ئیبراهیم پاشادا بوو. ئەم پیاوە دیدێکی زۆر خراپی سەبارەت بە ئێرانی و عوسمانی هەبوو، وای بۆ دەچوو کە سنووری نێوان ئەم دوو وڵاتە بەردەوام ئاڵۆز بووە. بابا پاشا لەگەڵ سەرداری ئێریڤان هاورا دەبن کە ئیبراهیم پاشا لە حکوومەت لابەرن و پیاوێک بە ناوی عەبدوڵا کە سەردار بە شیاوی حکوومەتی دەزانی بکاتە فەرمانرەوای سنووری نێوان دوو وڵات. لەژێر چاوەدێری بابا پاشادا، ئیبراهیم پاشا لە ئەرزرووم زیندانی بوو. بەڵام بە هۆی ئەوەی کە لەئەو ناوچەیەدا دۆستانێکی بە توانا و دەسەڵاتی هەیە توانی بە پیلانگێری و بەرتیلدان جارێکی دی ببێتەوە (پاشالیق)ەکەی خۆی. هەڵبەت ئەمکارە لە هەموو ڕوویەکەوە دژی ویست و خواستی حکوومەتی ئێران بوو. حکوومەتی دوایی بە سەختی سەرزەنشتی بابا پاشای کرد. وەک دەڵێن: بابا پاشاش بە ملهوڕییەوە وەڵامی دابووەوە و لە نامەیەکدا بۆ حکوومەتی ئێرانی نووسی: (ئایا نازانن کە چەندین سەدەیە دەسەڵاتی عوسمانییەکان جێگیر بووە؟)) وەڵامیان دایەوە کە:(تۆ دەتوانی سەبارەت بە لەمێژینە

بوونی بنەماڵەی عوسمانەوە بدوێی، بەڵام لەبیرت بێت کە پادشایەتی ئێران لە سەردەمی کەیومەرسەوە دەستپێدەکات کە یەکەمین خاوەنی جیهان بووە).

چونکە حەسەن ئاغا سەرکردەی تیرەی کورد کە هاتبووە لای سەردار لەگەڵی خزمایەتی هەبوو، لەگەڵ ئیبراهیم پاشادا دوژمنایەتی هەبوو، بەبێ دواکەوتن هەموو تیرەکەی خۆی لە بایەزیدەوە هێنایە ناوچەی ژێر دەسەڵاتدارییەتی ئێریڤان.

## لاپەڕەی ٤٤١

ڕۆژی دوازدەیەم لە قارس وەدەرکەوتین، هەرچەند بنکەی ڕێکوپێک لە جولاقدایە، شەو لە دەلی ئەحمەد ماینەوە. دیسانیش هەوا زۆر سارد بوو، ئەو کاتانەی لە دەرەوە بووین هەر موویەکی سمێڵمان وەک چلورەیەکی سەهۆل شۆڕ دەبوەوە و هەڵمی هەناسەمان دەیبەست. ڕۆژی سێزدەهەم لە کێوی درێ و دوورەدەست ساوانلوغ کە بەداری سنەوبەر و کاژ داپۆشرا بوو تێپەڕبووین. ئەم دارانە دەبنە داری ڕایەڵ و سووتەمەنی خەڵکی دەوروبەر. ئێرە حەشارگەی بەناوبانگی کوردە دزەکانە کە لە هاویندا مەر و ماڵاتەکانیان لە سێبەری دار و لەوەڕگەکاندا بەرەڵا دەکەن و خۆشیان بەردەوام چاوەدێری هاتوجۆی کاروانییەکان و ڕێبواران دەکەن. بەڵام ئەم ڕۆژانە بە زیپک و زاکۆنی و سامی بابا پاشا ئەوانی تووشی ترس و نیگەرانی کردووە.

**هاوپێچ**

پارە لە ئێراندا

دیـ نار=٥٠ شاهی= ١ ئە شرەفـ ی2/٥٠٠.

١٠/٠٠٠ دینار= ١٠ پیاستر= ١ تمەن.

٣ شایی= ١ شاهی.

٤ شاهی= ١ عەباسی.

٨ شاهی= ١ ڕیاڵ یاخۆ ڕوپییە.

١٠٠/٠٠٠ ڕوپییە= ئەلک.

٥ دینار= ١ غاز.

٢٠ دینار= ئەبیسی.

٢٥ دینار= ١/٢ شاهی.

٥٠ دینار= ١ شاهی.

٥٠٠ دینار= ١٠ شاهی= ١/٢ غروش (قروش).

١٠٠٠ دینار= ٢٠ شاهی= ١ غروش (قروش).

١/٢٥ دینار= ١ ڕیاڵ (قران).

- - - - - -

١ ـ ناوی ئەمرۆی شاهی لە شاهی سەردەمی سەفەوییەکان وەرگیراوە، بەڵام بە هۆی بەرزبوونەوەی بەهای زیو، نرخەکەی زیادی کردووە. ئێرانییەکان سکەیەکی بەرزتر لە تمەنیان نییە، جگە لە یەک سکەی گەورە کە پاشا بۆ شکۆ و مەزنیی گەنجینەکەی دروستی دەکات و لەگەڵ یەک هەزار تمەن یان دەهەزار پیاستر.

٢ ـ چونکە ناروونییەک لەمەدا هەیە، هەمووی لە خوارەوە دەنووسین:

٨ شاهی= ١ ڕیاڵ یاخۆ ڕوپییە.

٤/١/٤ ڕیاڵ= ١ Ditto.

٢/١/٢ ڕیاڵ= ١ Ditto.

٣ ـ بەهای ئەم پیاسترە پیشان دەدات(یەک پیاستر بەرانبەرە بە نزیکەی دووشیلینگی ئینگلیز). (( نێوەنجی ئاڵوگۆری پارەی ئێران و هیند یەک سەد و سی پیاستر لە بەرانبەر سەد ڕوپییەدایە)).

٤ ـ دوو مسقاڵ و شەش نوخود زیوە، هیچ یەک لەئەو سکانە کە لە ئێراندا دروست دەکرێت عەیاری نییە.